پەیامەکانی
گەنجان
٣٧

زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان ٩




# فیکری شاراوە

## چەند نمونەیەك لە فیلمە هیندییەکان

ئوسامە ئەنوەر



چاپی یەکەم






**ناوی کتێب:** فیکری شاراوە:

(چەند نموونەیەك لە فیلمە سینەماییەکان)

**نووسەر:** ئوسامە ئەنوەر

**بابەت:** فیکری، شیکاری، لێکۆڵینەوە

**دیزاینی بەرگ:** ڕێشاح حوسێن

**نۆبە وساڵی چاپ:** یەکەم/٢٠١٥

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**نرخ:** ٤٠٠٠ دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان

ژمارەی سپاردنی(١٦٥٧) ساڵی (٢٠١٥)ی دراوەتێ

" زۆر جار سەیرکردنی فیلم، ئەزموونکردنی واقیعێکە"

"پێشکەشە بە دایکم،

کە هەمیشە دەڵێ واز لەم شتە قۆڕانە بێنە و خەریکی خوێندنەکەت بە .."

"تەقەلاکەتم لا پەسەندە، تەرازوەکەت تازەیە و هی خۆتە. هەموو داهێنانێك بە یەکەمین هەنگاو دەستی پێکردووە، ئەم ئیهتیمامەت بەم بوارە و بەم شێوە ڕەنگە ئەوڕۆکە کەم کورد فکری لێبکاتەوە، ئەمە بۆخۆی گرنگ و سەرنجڕاکێشە. من وەك خوسرەو جاف تەرازوەکەتم لا زەریف هاتە بەرچاو. بەردەوام بە لە خۆتا، خۆبون دانە لە دەرگای داهێنان."

– خوسرەو جاف، نووسەری (دەغدو)

"ئەو نووسینە شەپۆلێ و ڕای گشتی و باوی نەکردۆتە پێوانە، بەڵکو ڕێچکەیەکی نوێی هەڵبژاردووە کە کەمتر پێ خوستی خۆماڵی لێ بەدی دەکرێ. دونیای فیلم کاریگەریەکی زۆری لەسەر کۆمەڵگە تازە پێگەیشتووەکان هەیە لەوانەش کۆمەڵگەی کوردەواری، بۆیە نووسەر لە جیاتی وەزارەتی ڕۆشنبیری و چەندین دام و دەزگای ئیداری و فەرهەنگی و تەعلیمی و یاسایی و دینی هەڵساوە بەو ئەرکە گرنگە بەوەی ڕۆچۆتە زانست و فەلسەفە و دین و دادگەری، کەلێنێکی زۆر گەورەی پڕکردۆتەوە تا بەهۆیەوە بتوانین مەیدانی هونەریش بەجێ نەیەڵین بۆ قەدەری عەولەمە، بەڵکو ئەکتیڤی بکەین لە قازانجی ناسنامەی خۆمان. ئەم کتێبە شایەنی بایەخپێدانە بە تایبەت لە قۆناغی ڕزگاری نیشتمانیان."

– مەسعود عبدالخالق، نووسەری (ڕەوشی فەلسەفی سەدەی ٢١)

"کتێبی ( فیکری شاراوە)م خوێندەوە، تێڕوانینی نوێتری بۆ فیلم لەلام دروست کرد. فێرت دەکات کە ئیدی (ماریفەت) لەتەك (چێژ) لە سەیرکردنی فیلمەکان وەربگریت و بسەنیت. چەندان بابەتی گرنگ و وردی لەڕێی پاشخانی فیلمەکان، خستۆتە بەر باس و شرۆڤە کردن. ئەوەی من ئاگەداریم، کتێبەکە تاقانەیە. یانی لەم بوارەدا هیچ کتێبێکی تری دەربارە نەنووسراوە. بۆیە لە ڕەفەی کتێبخانەی کوردییدا، سەنگدار و بەنرخ دەبێت. لە دنیای نوێی ئێمەدا، نەوەی نوێ بە بایەخەوە لە فیلم دەڕوانێت و هاتووچووی سینەمەکان باوە و، خەریکە دەبێتە نەریت. خوێندنەوەی ئەم کتێبە زۆر پێویستە، تا ئیدی دەروازەی دەرككردن بە فیکری شاراوە و پاشخانی هزریی فیلمە سینەماییەکان بێت."

– عەبدوڵلا عالایی، نووسەری (گوڵزاری ڕۆمیی)

**"تۆ دەتوانی نەخشەکێشی ژیانت بکەی لە ڕێگای ئەو فیلمانەی حەزی پێدەکەی "**

– ماری شمێچ (نووسەر)

**"زۆرێك لە ئێمە هۆشیارانە سەیری فیلمەکان ناکەین"**

– ڕۆجێر ئیبێرت (ڕەخنەگری فیلم)

**"دەزانیت کێشەی تۆ چییە، کێشەی تۆ ئەوەیە هێندە سەیری فیلمت نەکردووە تا بتوانی لە ڕێگایەوە مەتەڵەکانی ژیانت بدۆزیتەوە"**

– ستیڤ مارتین (ئەکتەری سینەمایی)

**" هونەر بە هەر ڕێگایەك بێت لە فیلم بەشدارە"**

– سیدنی پۆلاك (دەرهێنەری فیلم)




## پێشەکی نووسەر

### خاڵی یەکەم:

### "پێشەکی"

دووبارە دوای دوو ساڵ لە نووسینی کتێب، قەدەری چاپکردنی دێت و، دووبارە ناچار بە نووسینی پێشەکییەکی تر دەبین بۆی. کە ڕەنگە بۆ هەندێك بینینی ئەم هەموو پێشەکییە بێزارکەر و زیادە بێت، بەڵام ئیدی بەهۆی درێژیی ماوەی نووسین و چاپکردنی کتێبەکە، ناچارین زۆر بابەت کە لەم ماوەیەدا ڕوویانداوە، شیانبکەینەوە و باسیان لێوە بکەین. ئەم هەموو دووبارەیە بۆ ئەوەیە کە ئەم کتێبەش وەك کتێبەکەی تری ڕابردوو(دەروازەیەك بۆ ڕۆشنبیری) دوای دوو ساڵ لە نووسینی ڕێکدەکەوێت بە چاپی بگەیەنم، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك کە سەرەکیترینیان سەرقاڵبوونە بە خوێندن و کاری ڕێکخراوەیی و هەندێك هۆکاری تر. چەند خاڵێکی هاوبەش هەیە نێوان ئەم کتێبە و ئەویتریان، لە پێشەوە چاپکردنیانە دوای دوو ساڵ لە نووسینی. بەو پێیەی لە ڕەمەزانی ٢٠١٣ دەستم بە نووسینی کرد و لەگەڵ هاتنی جەژن تەواوم کرد، بە هەمان شێوەی کتێبەکەی تر لە ٢٠١١، کە دیارە قەدەری کتێبەکان بە ڕەمەزانەوە بەستراونەتەوە، ئەو مانگەی زۆرترین چالاکییەکانم لە نووسین کۆدەبێتەوە، ئەوەش بەهۆی ڕەخساندنی کات لەو کەشە گشتییەی باڵدەکێشێت بەسەر ئەم هەرێمەمان لەو کاتەدا و دروستبوونی بارێکی

تایبەت بە نووسین و چالاکییە ئامانجدارەکان تێیدا بۆمن، کە مرۆڤی پەیوەست بوو بەم مانگە پیرۆزەوە، دەکرێ لە هەر کاتێکدا ئەم کەشە تایبەتە بدۆزێتەوە و زۆرترین وزەی لە پرۆژە و کارەکانیدا سەرف بکات، پێچەوانەی ئەوانەی ڕەمەزان بە مانگی شەکەتی و ماندووبوون دەزانن. بۆیەش پرۆفیسۆر (تاریق ڕەمەزان) کە بەپێی گۆڤاری (TIME)ی ئەمریکی یەکێکە لە ١٠٠ کەسە کاریگەرەکانی سەدەی ٢١ و بەپێی گۆڤاری (Foreign Policy)یش وەک یەکێک لە ١٠٠ بیرمەندە جیهانییەکان هەژمارکراوە.[١] دەربارەی مانگی ڕەمەزان دەڵێت:"بەرجەستەبیانە، ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە دەبێتە ڕێکخەریی ژیانی کۆمەلایەتیی و پرۆفیشنالیی مسوڵمانان، ئەوەش نەک تەنها بە کۆمەڵ، بەڵکو لەلایەنی تاکەکەسی، کە بڕوابەخۆبوون و پەڵەیی لێ درووست دەبێت."[٢]

ئێستا کە ٢٠١٥یە، دوو ساڵ تێپەڕیوە بەسەر نووسینی ئەم کتێبە، لە نێوان ئەم دوو ساڵەش چەندین نوێکاری و ڕووداوی گەورە هاتوونەتە پێشەوە کە دەکرا کتێبەکە زیاتر دەوڵەمەند بکات لە سەرچاوە و پڕتربوونی بابەتەکانەوە، بەڵام ئیتر بۆ پاراستنی زەمەنی نووسینی کتێبەکە و تێکنەدانی ئەو فیکرەی بەرامبەر بابەتەکان هەمبووە لە ٢٠١٣دا، ڕێم بەخۆم نەدا دەستکارییەکی ئەوتۆی بکەم، تەنها ناوهێنانی هەندێ فیلم نەبێت کە لە ساڵی ٢٠١٤ دەرچوون و وەک سەرچاوەیەک بەکارمهێناون بەرامبەر بابەتەکان.

## خاڵی دووەم:

## "ڕوخانی شارستانییەت: لێکدانەوە تیۆرییەکان"[3]

یەکێك لەو ڕووداوە گرنگانەی لەو ماوەیەی نووسینی ئەم کتێبەی تێدا تەواوبوو تا چاپکردنی، بریتیبوو لە سەلماندنی بیردۆزێکم کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا لە لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر لەسەر ڕۆمان و فیلمی سینەمایی (کلاود ئەتڵەس) خستبوومەڕوو بەم شێوەیەی خوارەوە.

لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کە بە هاوکاری ی ئاژانسی ناسا (NASA)ی ئەمریکی کراوەو ئەنجامەکەی لەهەردوو ڕۆژنامەی بەناوبانگی بەریتانیی(Independent)[4] و (Guardian The)[5] دەرکەوتووە، کە لە ١٤ و ١٦ی مانگی سێی ٢٠١٤بڵاوبوویەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە لە لایەن بیرکاریناس (سەفا موتەشەری) ئەنجامدراوە و تێیدا ئاماژە بە ڕوخانی شارستانییەتی ئێستای مرۆڤایەتی کراوە بەهۆی چەند هۆکارێکی جۆراوجۆرەوە. کە ئەوەش یەکانگیرە لەگەڵ چەند پەرەگرافێکی بابەتەکانی ئەم کتێبەدا، سەرەتا چەند پەرەگرافێك لە لێکۆڵینەوەکە دەهێنین و بەراوردی دەکەین لەگەڵ ئەوەی من نووسیومە. پێش دەستپێکردن، دەمەوێ بڵێم کەوا من نووسینی ئەم کتێبەم لە مانگی نۆی ٢٠١٣

تەواوکردووە، لە کاتێکدا ئەم لێکۆڵینەوەیە مانگی سێی ٢٠١٤ دەرچووە، واتە شەش مانگ دوای نووسینی ئەم کتێبە. ئەو هاوڕێیانەی لەم ماوەیەدا بە کتێبەکەمیان دیوە و خوێندوویانەتەوە ئاگاداری ڕاستیی ئەو نووسینانەن.

لە لێکۆڵینەوەکەهاتووە: "بەپێی چەند ریکۆردێکی مێژوویی دەرکەوتووە کەوا شارستانییەتە ئاڵۆزەکان ئەگەری ڕوخان ولەناوچونیان بەهێزە، کە ئەوەش جێگای پرسیارکردنە لەو شارستانییەتەی ئێستا تێیدا دەژین. بەپێی ڕوخانی شارستانییەتی رۆمانی و چەند شارستانییەتێکی تری وەك هانوما و ریان وگەپتە،هەروەها چەند شارستانییەتێکی تری ناوچەی میسۆپۆتامیا، هەموویان بەرەو ئەو ڕاستییە دەچن کە شارستانییەت تا چەند خۆگرتوو و پێشکەوتوو و ئاڵۆزبێت، ئەگەری ڕوخانی هەیە و بوونی حەتمی نییە". لەلێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەچەند هۆکارێك دەکات بۆ لەناوچوونی ئەم شارستانییەتەی ئێستا، لەوانە "دابەش نەکردنی سەروەت وسامانی جیهان بەیەکسانی ونەمانی هاوسەنگی نێوان دانیشتوانی ئەو شارستانییەتانە. ئەوەش واتە بەهۆی نایەکسانی نێوان مرۆڤەکان و زۆری بەکارهێنانی سەرچاوە سروشتییەکانی زەوی و گۆڕان لەکەش وهەوادا".

من لەم کتێبەدا، لەشیکردنەوەی بابەتێك بەناوی (وتەکانی دایڤد میشێل لە ڕێگای (Cloud Atlas)ەوە کە لە بەشی یەکەم، خاڵی حەوتەم بەشێوەیەکی تیۆری (نظري) تێیدا لە پەرەگرافێکدا ئاماژەم بەم حاڵەتە کردووە و نووسیومە: "مرۆڤایەتی کاتێك تا دوا پلەی شارستانییەت دەڕوات، لەوێوە بەهۆی جەنگێکەوە یاخود هەر هۆکارێکی وێرانبوونی جیهان دەگەڕێتەوە بۆ چاخە بەردینییەکانی خۆی، وەك ئەوەی تازە ژیان لەسەر زەوی دەستیپێکردۆتەوە".

یاخود لە پەرەگرافێکی تردا بەروونی باسمکردووە و گوتومە: "بەو پێشبینییەی (دایڤد) بێت، درووستکردنی هەرەمەکان بۆ نموونە، دواین سنوری شارستانییەتی ئەو کاتەی میسرە، لەناوچوونی ئەو شارستانییەتە گەڕانەوەی مرۆڤە بۆ سەردەمێکی وەك ئێستا، کە توانای بونیادنانی شتێکی لەو جۆرەی نەبێت و بەتواناکانی ئەوکات سەرسام بێت لە چۆنییەتی درووستبوونی هەرەمەکان. ڕەنگە ئێمەش لە ئێستادا چەندین شارستانییەتمان تێپەڕاندبێت. بەپێی ئەو پێشبینییەی (دایڤد) بێت، ئێمە لە ئێستادا خەریکی درووستکردنەوەی شارستانییەتێکی ترین".

هەروەها لە بەشی دووەم بە ناوی "جیهان : لە وێرانبوون و دوای وێران بوون"، خاڵی پێنجەم، لە چەند پەرەگرافێکدا نووسیومە: " ئەو(دایڤد) پێی

وایە مرۆڤ سنووری هەیە بۆ پێشکەوتن، سنوورێك بۆ تەکنەلۆژیا، سنوورێك بۆ شارستانییبوون، کاتێکیش ئەو سنوورە دەگات بە کۆتایی، بەهۆی یەکێك لە هۆکارەکانی وێرانبوونی زەوی ئەو سنورە کۆتایی پێدێت و مرۆڤایەتی دەگاتەوە بە سەرەتا، سەرەتایەك بۆ بونیادنانی شارستانیەتێکی تر، وەك ئەوەی لەسەر ڕێڕەوێکی بازنەیی بێت و کاتێك دەگاتەوە خاڵی دەستپێکردن، بڕوخێت و دووبارە درووستبێتەوە."

هەروەها لە پەرەگرافێکی تری لێکۆڵینەوەکە هاتووە تێیدا هاوڕای ئەوەیە کە لە سەرەوە نووسیومە: " ئەو پرۆسەی هەڵسانەوە و ڕوخانی شارستانییەتە وەك خولێکی بازنەیی وایە بەنێو مێژوودا."

هەڵبەت خاڵی هاوبەشی ئەوەی من نووسیومە بە شێوەیەکی تیۆری و ئەوەی بە لێکۆڵینەوەی زانستی سەلمێنراوە، ئەوەیە کە هیچ شارستانییەتێك خاوەن بوونێکی هەمیشەیی نییە و سنووری هەیە و ڕوخانی پێویستە بۆ دووبارە بونیادنانەوەی شارستانییەتێکی تر، لەگەڵ ئەوەی لە لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوە کراوە دەتوانرێ شارستانییەت لەم ڕوخانە رزگاربکرێت، بەڵام ئەگەرێکی زۆر لاوازە. بێگومان ئەم بابەتە شتێکی نوێ نییە، بەڵکو لە پێشدا چەندین زانای وەك ابن خلدون، ئارنۆڵد تۆینبی و ئۆسواڵد سپێنگلێر باسیان لێوە کردووە، بەڵام ئەوەی ئارنۆڵد تۆینبی لە

کتێبەکەی بە ناوی (لێکۆڵینەوەیەك لە مێژوو)دا نووسیویەتی لەسەر ئەم بابەتە، ڕەنگە نزیکترینیان بێت لەم لێکۆڵینەوە زانستییەی ئێستا سەلمێنراوە. هیچ ئاگەداری ئەم زانایانە و کارەکانیان نەبووم لەم بارەوە تا ئەو کاتەی برادەرێك پێیانی ناساندم، خۆشحاڵبووم بەوەی لەگەڵ ئارنۆڵدا لە چەند خاڵێك هاوبەشین. سەرەتا بە بینینی هەواڵەکە و خوێندنەوەی، زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی توانیومە بە لانی کەم پێشبینییەکم لەسەر بابەتێکی وەها گرنگ ڕاست دەربچێ. هەروەها ئەم بابەتە بەشێکی بچوکە لەم کتێبە، کە دەکرێ لە داهاتوودا چەند بیردۆز و پێشبینیی تر کە تێیدا هاتووە، ڕاست دەربچێ و بە لێکۆڵینەوەی زانستی بسەلمێنرێت.

لە کۆتاییی ئەم پێشەکییەدا، دەمەوێ زۆر سوپاس ئەو هاوڕێ دڵسۆزانە بکەم کە بە هەر شێوەیەك بێت لە بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبەدا بەشداربوون و بە پێشنیار و ڕەخنەکانیان زیاتر دەوڵەمەندیان کرد و یارمەتیدەرم بوون لە نووسینی. هەروەها ئەم مامۆستا ئازیزانەی پێشوەخت کتێبەکەیان خوێندەوە و ڕاشکاوانە بۆچوونی خۆیان لەبارەوەی نووسی. ئەوەی لەم کتێبەدا هاتووە تەواوی بیرکردنەوەی منە لە (٢٠) ساڵیمدا، پێم وانییە شتێك مابێتەوە و نەمنووسیبێت لە ئێستامدا.

ئوسامە ئەنوەر

بەهاری ٢٠١٥ – هەولێر، کوردستان

# پێشەکی کتێب

## خاڵی یەکەم:

## "گەڕانەوەیەك بۆ ڕابردوو"

لەبیرمە کاتێك منداڵ بووم، زۆر حەزم لە فیلمی قالب ئاسن(پیاوی ئاسن) بوو، لەوەش ئەو کاتە ڕەنگە مەبەستم لە فیلمەکانی (Terminator)و (Robocop) بوبێت، چونکە بەڕاستی ئێمە نە ناوی فیلمەکانمان دەزانی نە ئەوەی کە ئامانجی فیلمەکان چییە، پێشم وایە ئەمە لەسەر زۆرێك لە خەڵکی ئێمە جێبەجێ دەبوو نەك تەنها من و دەورووبەرم، تاکە ئامانجمان خۆشی بینین بوو لە فیلم، ئەوەی دەمانزانی تەنها ناوی هەندێك ئەکتەری ناوداری وەك (بروس لی و جاکی شان و رامبۆ...هتد) بوو، تەنانەت ناوی ڕاستی زۆرێك لە ئەکتەرەکانمان نەدەزانی. بەردەوام حەزمان لە بینینی فیلمە ئاکشنەکان بوو، ئەو فیلمانەی زۆرترین جوڵەیان تێدایە لەوەی گفتوگۆ و دیمەنی هەست بزوێنی تێدابێت. دەتوانم بڵێم لەوکاتەدا سینەما لای ئێمە تەنها بریتیبوو لە فیلمی ئاکشن جا ئەمریکی بێت یان هیندی، حەزیشمان لە فیلمی ترسناك دەکرد جار جار.

فیلمی هیندیش ئەو کاتە رەواجێکی زۆری هەبوو، هێندەی فیلمە ئەمریکییەکان ناوبانگی هەبوو لای ئێمە، بیرمە ئەو کاتە چاوەڕێی ڕۆژی هەینیمان دەکرد بۆ بینینی، چونکە تەنها لە ڕۆژانی هەینی لە چەند کەناڵێکی دیاریکراو فیلمی هیندی پیشاندەدرا. لە ئێستادا کەناڵی تایبەت بە فیلمی هیندی هەیە لەگەڵ ئەوەی بە بەراورد لەگەڵ ئەو کاتە بینەری زۆر کەمە. ئەو حەزکردنە لەم فیلمە هیندییانە ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بوبێت کە فیلمی هیندی جگە لە یەك جۆری فیلم تێپەری نەدەکرد، بەو واتایەی تەنها جۆری فیلمەکان ئاکشن بوو، هەندێك جاریش ڕۆمانسی و ئاکشن بەیەکەوە بوو. فیلمە (درامایی و کۆمیدی و ڕۆمانسی و هەست بزوێن...هتد) هیچ بایەخێکی لامان نەبوو یاخود زۆر بە کەمی، حەزمان بە بینینی گفتوگۆ نەدەکرد، ڕەنگە بەشێکی بەهۆی نەزانینی زمانەوە بوبێت، بەشێکی تریشی بەهۆی ئەوەوە بوبێت کە کەناڵەکانی ئەوکاتە تەنها فیلمە ئاکشنەکانیان پەخش دەکرد، سینەماکانیش بەهەمان شێوە. ناڵێم هەمووی هەر هەڵەی ئێمە بووە، نەخێر، تەنها خەڵکی ئێرە حەز بەو جۆرە فیلمانە ناکەن، بەڵکو ئەو کاتە زۆرینەی خەڵکی وڵاتانی تریش، تەنانەت لە ئەمریکا فیلمە ئاکشنەکان زۆرترین رەواجیان هەبووە، گەر لێرە هۆکارێکی تر زیاد بکەین، دەتوانین بڵێین هەلومەرجی کوردستان لەو کاتەدا کاریگەری لەسەر

تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایەدا هەبووە، ئەوەش بەهۆی ئەو مێژووە پڕستەم و جەنگەی کوردستان هەیبووە لەم ساڵانەدا.

ئەوانە هیچی گلەیی نین لە خەڵکی ئێمە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەنگاوێکی زۆر گرنگ بووە، چونکە هەم مێژووی سینەما لێرە مێژووەکی کورتە، هەم خەڵکی ئێمە بۆی نەرەخساوە گرنگی بەو لایەنە بدات، دەتوانم بڵێم ئێمە لە دوای ساڵی ٢٠٠٠ەوە زیاتر بەرەو ڕووی سینەما کراینەوە. چونکە پێشتریش بەهۆی هەموو ئەو نەهامەتیانەوە بۆمان نەرەخساوە تەنانەت ناوی فیلمەکانیش بزانین. ئەوەی دەمانزانی (مەرد)ی هیندی و (تایتانیک)ی ئەمریکی بوو، ڕەنگە هەندێ ناوی تریش. دوای تێپەڕبوونی ئەو قۆناغە و رەخسان و هاوسەنگبوونی شێوەژیانی تاکی ئەم کۆمەڵگایە و باشتربوونی خزمەتگوزاری، خەڵکی حەزی بە بینینی زنجیرە فیلمەکان و بە تایبەتی درامای تورکی کرد، بە جۆرێك ئەوە لە ئێستاشدا تا ڕادەیەك باوە، خەڵکی ئێمە حەز بە زنجیرە فیلمی تورکی و ئێرانی دەکات ئەگەرچی لە جۆری دراماش بن. ئەوە قۆناغێکی نوێبوو، خەڵکی لە فیلمی ئاکشنەوە بەرەو فیلمی ڕۆمانسی و دراما هەنگاو بنێت، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت کلتوری تورك و فارس لە ئێمەوە بە جۆرێك نزیك بێت بە تایبەت کاتێك دەبینین بەشێکی زۆر لە خەڵکی ئێمە بۆ نموونە زنجیرە فیلمی (بێریڤان)ی تورکی بینیوە. ئەم قۆناغە تا ئێستاش بەردەوامە بەڵام خەریکە لە ئێستاوە

قۆناغێکی نویٚ دەستپێبکات کە خەڵکی ئێمە یەکسان بکات لەگەڵ خەڵکی وڵاتانی تر، بە جۆرێك خەڵکی ئێمە بگاتە قۆناغێك کە وەك تاکێکی ئەمریکی ناوی فیلمەکان بزانێت و جۆری فیلمەکە بزانێت و ناوی دەرهێنەر و ئەکتەرەکانیش بزانێت، ئەو قۆناغە لای زۆرێك لە تەمەشاکەرانی فیلم دروست بووە و دەستی پێکردووە، بەڵام تەنها ئەوەندەی ماوە گشتگیر بێت، بە جۆرێك خەڵکی ئێمە گشتی بەو شێوەیەی لێبێت. دروستکەری ئەو قۆناغەش چەند هۆکارێکە، خزمەتگوزاری باشی هاوڵاتیان و رەخسانی ژیانێکی دوور لە جەنگ و ترس بە پلە یەك وجیهانی ئینتەرنێت بە پلە دوو، هەروەها کرانەوەی سینەمای نێودەوڵەتی بە پلە سیٚ، کە لە ئێستادا خەریکە گەشە دەکات و خەڵکێکی زۆر ڕووی تێدەکات، بۆیە ئاساییە گەر بڵێم لە چەند ساڵی داهاتوودا ئەو قۆناغە بێت و بەشێکی زۆری خەڵك چیتر خۆی بە زنجیرە تورکی و فارسیەکان خەریك نەکات، بەڵکو ڕاستەوخۆ وەك تاکێکی ئەمریکی بینەری فیلمەکانی هۆلیۆد بێت .

بەڵام باسەکەی ئێمە ئەوە نیە، چونکە ئامانج لە بڕینی قۆناغەکان و سەیرکردنی فیلمەکان نیە، بەڵکو بریتییە لەوەی بۆچی سەیری فیلم دەکەین؟ ئایا تەنها بۆ ئەوەی وەك خەڵکێك کۆتایی هەفتە بچینە سینەما و دواین فیلمەکان ببینین؟ تەنها بۆ ئەوەی چێژ لە فیلمەکان ببینین؟ تەنها بۆ ئەوەی لە دیاریانەوە پێبکەنین یاخود بگرین؟ ئەی دەربارەی ئەو هەموو

بیرۆکه و ئامانج و پەیامە شاراوانەی فیلمەکان هەیانە چیبکەین؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە لە فیلمەکان تێبگەین و بە چاوێکی ترەوە سەیریان بکەین؟ کاتی ئەوە نەهاتووە چیتر دەرهێنەرە سینەماییەکانمان بە پەنجەی دەست نەژمێردرێن و ئەو خۆشەویستیەی خەڵکی ئێمە بۆ سینەما هەیەتی بیخەینە نێو خودی سینەما و رکابەری وڵاتانی تری پێبکەین؟

دەکرێ ئەو حەزەی من هەمبوو لەم جۆرەی فیلم کە منداڵ بووم، هۆکاری ئەوە بوبێت کە زۆرترین جوڵە یاخود شتانێکی سەرنجڕاکێشی تێدابووە، هەروەها ئەم خەڵکەی ئێمەش هەمان ئەو حەزەی منداڵی منیان هەیە لە ئێستادا، بەڵام دەکرێ ئەو حەزە بگۆڕدرێت و بنەماکەی ببێت بە فێربوون لە فیلم و سەیرکردنی لە ڕوویەکی زانستیانە و لێکدانەوە و شیکردنەوەی پەیامە فەلسەفی و مەعریفیەکانی شان بە شانی ئەو چیرۆکەی پێیەوە بەستراوە، یان بە جۆرێکیتر تێگەیشتن لەو بنەما فیکری و فەلسەفییانەی فیلمەکان هەڵگرین و بوونی فیلم بە هۆکارێکی گەورەی فێرکردن و فێربوون لێیەوە.

## خاڵی دووەم:

## "بۆ فیکری شاراوە؟"

لە خاڵی یەکەم هەندێك پرسیارمان بەجێهێشت، کە لێرەدا پێویستیان بە وەڵامە. زۆرێك لە ئێمە سەیری فیلم دەکات و چێژی لێدەبینێت، بێ ئەوەی بیر لە خاڵە گرنگەکانی بکاتەوە، یاخود ئەسڵەن نایبینین. لەم کتێبەدا دەمەوێت هەندێك لەو خاڵە گرنگانە بخەمەڕوو. فیلمەکان تەنها چیرۆکێکی هەست بزوێن و درووستکراوو و دەرهێنراو نین، بەڵکو زۆرێکیان هەڵگری چەندین بنەما و ململانێی فیکرین کە هەوڵی سەلماندنی تیۆر و گێرانەوەی مێژوو و پێشاندانی تیۆرێکی فەلسەفی دەدەن، ئەوانەش بە چیرۆکی فیلم دادەپۆشرێن و دەشاردرێنەوە، بە شێوەیەك بینەر ئەگەر بێتوو لە نزیکەوە بۆی نەڕوانێت، نایدۆزێتەوە، ئەوەش تەنها بینەری خۆمانە ناگرێتەوە، بەڵکو لە گشت وڵاتان بەهەمان شێوەیە، سەیری ریزبەندی فیلمەکان بکە لە هەفتەدا، بە ئەستەم دەبینی فیلمێکی درامایی یاخود ڕۆمانسی ببێتە یەکەمی هەفتە لە سینەماکاندا، هەمیشە فیلمە کۆمیدی و ئاکشنەکان لە پێشەوەن، چونکە فیلمە درامایی و زانستی و فیکرییەکان پێویستیان بە بیرکردنەوە زیاترە لە فیلمەکانی تر. ئایا ئەوە پێمان ناڵێت کە خەڵکێکی زۆر گرنگی بە خۆشی بینین لە فیلم دەدەن زۆر زیاتر لەوەی کە بیربکەنەوە

لەگەڵی و لێی تێبگەن؟ هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو تەنانەت لەڕووی سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەوە، فیلم کاریگەرییەکی ناڕاستەوخۆی تەواوی لەسەر کۆمەڵگا دروستکردووە. دەکرێ فیلمگەلێکی یەکجار نایاب ببینین، کە لە دواوەیان پەیامێکی سیاسیی و شاراوەیان هەڵگرتووە بۆ لێدان لە لایەنێکی سیاسی، زۆر جار نەتەوەیەک. هەرچی لە ڕووی فیکریشەوەیە، هەوڵمداوە بۆ گفتوگۆکردن و لێکۆڵینەوەی چەند بابەتێکی فیکری، فیلم بکەم بە سەرچاوە، لەوەشدا دەتوانم بڵێم فیلم هۆکار و فاکتەرێکی یەکجار گرنگە بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتن لە چەندین بابەتی فیکری و تیۆریی فەلسەفی و دەروونی و کۆمەلایەتی.

نامەوێ لە ڕێگای ئەم کتێبەوە شیکردنەوەی فیلم و گەڕان بەدوای خاڵی فیکری لە فیلمدا بە گشتی بکەم، بەڵکو تەنها چەند نموونەیەک لە فیکرە شاراوەکانی فیلمەکانم خستۆتە ڕوو. ئەوەش بۆ ئەوەی فیلمەکان وەک سەرچاوەیەکی فیکری پیشان بدەم و بڵێم کە زۆر جار دەکرێ ئەو بابەتە گرنگانەی لە فیلمێکدایە هێندەی چەندان کتێب سوودی هەبێت. کە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆمان و چیرۆک دەکرێت، بۆ نەتوانرێ لەسەر فیلم بکرێ؟ پێم باشە لێرەدا بەرچاو ڕونییەک لەسەر بەشەکانی کتێبەکە بدەم بە خوێنەران پێش خوێندنەوەی.

بەشی یەکەم بریتییە لە خوێندنەوەیەك بۆ ڕۆمانێکی ئینگلیزی کە کراوەتە فیلم بە ناوی (Cloud Atlas) (هەوری ئەتڵەس)، بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر لەسەر ڕۆمانەکە و تێیدا چەند بابەتێکی باوم باسکردووە  کە لە حەوت خاڵدا خۆی دەبینێتەوە. بەشی دووەم بریتییە لە بابەتێکی باوی نێو فیلمەکان لەم سەردەمەدا، ئەویش بابەتی کۆتایی هاتنی جیهانە(Apocalypse) کە خەڵکێکی زۆر لەم سەردەمەدا گرنگی بەو جۆرە فیلمانە دەدات و لە ئێستادا زۆرترین ڕەواجی هەیە، ئەم بەشە خاڵێکی تایبەتە بە جۆرەکانی کۆتایی هاتنی جیهان لە بنەمای فیلمە سینەماییەکان و خاڵێکی تری دەربارەی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤە لە دوای کۆتایی هاتنی جیهان کە هەڵگری شیکردنەوەی کاردانەوەکانی دەروونی مرۆڤە لەم جیهانەدا، ئەم بەشە زیاتر لە گفتوگۆیەکی فیکری دەچێت دەربارەی کۆتایی هاتنی جیهان و چۆنیەتی شێوەژیانی مرۆڤ لە ئەگەری کۆتایی هاتنی جیهان، جگە لە باسکردنی چەند دیاردەیەك لەو کاتەدا. بەشی سێیەم دەربارەی زانستی خەونە، کە تا ئێستا ڕەنگە ئاڵۆزترین زانست بێت، لەوێدا بەراوردێك دەبینین لە نێوان زانستی خەون لە چەند فیلمێکدا لەگەڵ ئەوەی لە واقیعدا هەیە، دواتر خوێندنەوەیەك بۆ خەون دەکەین و جۆرەکانی لێك دەدەینەوە، لە پاشاندا بیرۆکەی فیلمەکان دەربارەی خەون لە داهاتوودا بەراورد دەکەین لەگەڵ ئەوەی دەکرێ لە

واقیعدا ڕوودەدات. لە بەشی چوارەم، باسی ترسی مرۆڤ دەکەین لە داهاتوودا، ئایا ئەو ترسانە چین کە مرۆڤ لە ئێستادا هەیەتی بۆ داهاتوو؟ ئایا ترسی مرۆڤ چی دەبێت لە داهاتوودا؟ ئایا پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و گۆڕانی سروشتی مرۆڤ شتانێکن پێویستە لێی بترسین؟ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە لەم بەشەدا دراوەتەوە، شتانێکی نوێ باسکراوە و خراوەتەڕوو کە تا ئێستا زۆر بە کەمی لەسەریان نووسراوە. لە بەشی پێنجەم، باسی ئەخلاق دەکەین، کە چۆن لە سەرەتای بوونی مرۆڤەوە تا ئەو کاتەی کۆتایی دێت دەبێتە پارێزەری و هۆکاری مانەوەی لە بازنەی مرۆڤایەتیدا، لەم بەشەدا هەوڵی سەلماندنی ئەو ڕستەیەمان داوە، بێگومان ئەوەش لە ڕوانگەی چەند فیلمێکی سینەمایی.

لە پاشکۆدا، سێ بابەتی گرنگ باسکراوە، بەهۆی گرنگی و نەبوونی ئەو جۆرە بابەتانە حەزمکرد وەك پاشکۆ لەم کتێبەدا دایبنێم، چونکە هەرسێکیان جۆرێکن لە لێکۆڵینەوە، لە بابەتی یەکەمدا باسی فەیسبووکمان کردووە، کە ئایا چۆن دەبێتە جیهانێکی جیاواز و مانەوەی لە نێوان واقیع و خەیاڵدا، لەوێدا چەند زانیارییەکمان باسکردووە، لە پاشاندا چەند هۆکارێك کە وادەکەن بڵێین فەیسبووك جیهانی دووەمە. بابەتی دووەم بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی یارییە ئەلیکترۆنیەکان و تێکەڵکردنیان لەگەڵ زانست و فیکر و فەلسەفەدا، لەو بابەتەدا یاری ( Bioshock

Infinite) مان وەك نموونە باسكردووە و خوێندنەوەیەكمان بۆ ئەو بنەمایانە كردووە كە یارییەكەی لەسەر دروستكراوە، لە پاشاندا وەك هەنگاوێكی گەورە بۆ تێكەڵكردنی زانست و فەلسەفە لەگەڵ یارییەكە نیشانمان داوە، دواتر چەند وتەیەكی نێو یارییەكەمان شیكردۆتەوە كە لە لایەن كاراكتەرەكانی یارییەكەوە وتراوە و هەڵگری چەند پەیامێكی فیكری و ئایدیۆلۆژین. لە بابەتی سێیەمدا، باسی پێویست بوونی دونیابینی ئاشتی مسوڵمانمان كردووە، بەو واتایەی كە تاكی مسوڵمان پێویستە لەم سەردەمەدا دونیابینی چۆن بێت، لەوەش نموونەمان بە هونەرمەند (سامی یوسف) هێناوەتەوە و وەك كەسێكی خاوەن ئەم دونیابینییە باسمان لێوە كردووە. حەزدەكەم بڵێم كە بۆ خوێندنەوەی ئەم كتێبە پێویستتان بە بینینی فیلمەكان نابێت، بۆیە ئەگەر تۆ كەسێكی زۆر حەز بە فیلمیش ناكەیت دەتوانی بیخوێنیتەوە، گرنگ رۆچوون و تێگەیشتنە لە بەشە فیكرییەكانی ئەم كتێبە، بەلام بێگومان سەیركردنی فیلمەكانیش كارئاسانیت بۆ دەكات لە تێگەیشتنی زۆربەی بابەتەكان.

ئامانجی ئەم كتێبە بوون بە دەروازەیەكە بۆ دۆزینەوەی فیكر لە فیلمدا، لە پاڵ ئەوەشدا باسكردنە لە چەند بابەتێكی فیكری شاراوە كە زۆر بە كەمی باسكراوە، هەروەك بریتییە لە پیشاندانی چەند بیرۆكەیەكی نووسەر لە پاڵ ئەو بابەتە فیكرییانە و گفتوگۆ كردن لەسەری.

## "خوێندنەوەیەك بۆ فیلم و ڕۆمانی (Cloud Atlas)"

(Cloud Atlas) ، فیلمێكی دراماییی و خەیاڵی-زانستیە، لە ساڵی ٢٠١٢ لە لایەن هەردوو دەرهێنەری بەناوبانگ (لانە و ئاندی واچۆسكی و تۆم تیكەر) دەرهێنراوە. لانە و ئاندی، یان وەك زۆرجار پێیان دەوترێ (واچۆسكییەكان) بەیەكەوە دەرهێنەر و نووسەری دەق و بەرهەمهێنەری چەندین فیلمی سینەمایی بەناوبانگی ئەمریكین، لەم فیلمانە ( The Matrix) و (V for Vendetta)، كە دوو فیلمی جیهانین تا ئێستا. چیرۆكی ئەم فیلمە لە شەش سەردەمی جیاواز سەرچاوەی گرتووە كە هەر سەردەمێك چیرۆكێكی تایبەت لەخۆ دەگرێت و گشتیشیان پەیوەندییەكی تەواویان بەیەكەوە هەیە لەگەڵ ئەوەی كە ساڵی سەردەمەكان زۆر لەیەكەوە دوورن.

بنەمای چیرۆكی فیلمەكە بەم شێوەیە پێناسە كراوە: (چالاكییەكانی تاكێك لە هەر سەردەمێكدا كاریگەر دەبێت بەسەر تاكی داهاتووی سەردەمێكی تر، بكوژێك لەم سەردەمە ڕەنگە دوای سەدەیەك ببێت بە پاڵەوانێك، یاخود بیرۆكەیەك لە ئێستادا دەتوانرێت بگۆڕدرێت بۆ شۆڕشێك لە داهاتوودا).

له (Cloud Atlas) زۆر ئەکتەری بەناوبانگ ڕۆڵیان تێدا گێڕاوە، بۆ نموونە (تۆم هانکس ، هاڵ بێری، جیم برۆدبێنت، هوگۆ ویڤینگ...)، یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانی ئەم فیلمە ئەوەیە کە تەنها چەند ئەکتەرێکی دیاریکراو، کە ژمارەیان نزیکەی ١٣ کەسە، ڕۆڵی چەندین کاراکتەریان بینیوە لەیەك کاتدا، ئەوەش بەهۆی چیرۆکی فیلمەکەیە کاتێك باس لە شەش سەردەمی جیاواز دەکات و هەر یەکێك لەم ئەکتەرانە رۆلێکی جیاواز لەویتریان هەیە لە هەر سەردەمێکدا.

ئەگەرچی (Cloud Atlas) بە فیلمێکی (خەیاڵیزانستی) هەژمار دەکرێت، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆریش لە باسێکی سایکۆلۆژی و دینی و مرۆیی نزیکە، ئەم فیلمە خاوەن چەندین خەسڵەتی ترە کە جیای دەکاتەوە لە هەر فیلمێکی تر، تێیدا چەندین بیرۆکە و سروشت و کێشە ئاڵۆزەکانی مرۆڤ باسکراوە کە ئەستەمە گشت ئەوانە لە فیلمێکدا جێگای بکرێتەوە، بەڵام ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆمانەی کە لەسەری دەرهێنراوە، واتە شێوازی نووسینی ڕۆمانەکە.

(Cloud Atlas)، لە هەمان کاتدا لە ڕۆمانی نووسەری بەناوبانگ (دایڤد میشێل) وەرگیراوە، میشێل یەکێکە لە ڕۆماننوسە ناودارەکان و ڕۆمانەکانی فرۆشێکی زۆریان هەیە، جگە لە (Cloud Atlas)، دایڤد خاوەنی چوار

ڕۆمانی تره که هیچیکیان وهك (Cloud Atlas) سهرکهوتوو نهبوونه و له ئیستاشدا دوایین ڕۆمانی (The Bone Clocks)ه که بڕیاره له ۲۰۱٤ بلاوبکریتهوه.

ئیمه بۆ باسکردن لهم بهرههمه و خستنهڕووی خاڵه گرنگ و فیکرییهکانی و خویندنهوه بۆیان، پهنا دهبهینه بهر فیلمهکه نهوهك خودی ڕۆمانهکه، ئهوهش لهبهر چهند هۆکاریك:

۱-وهك سروشتی خۆی بینراو کاریگهری زۆر زیاتره له خویندراو، بۆیه فیلمهکه کاریگهری زیاتره له ڕۆمانهکه و ئهوهی دهتوانریت له فیلم پیشان بدری له ههست و شیوازی قسهکردن و بهرجهستهکردنی کارهکتهرهکان له شتیکی نووسراو ناتوانریت پیشان بدری، یان به جۆریکیتر بهرجهستهبوونی ڕۆمان له فیلمدا بچوککردنهوهی بازنهی ئهندیشهکردنی نووسینهکان یاخود ههر نههیشتنیهتی، بهوهش بینهر ههرچی دهبینیت بی ئهندیشهکردن باشتر تیدهگات لهوهی دهیخوینیتهوه له ڕۆمانهکه.

۲-ئهو ئهکتهرانهی له فیلمهکه بهشداریانکردووه کهسانیکی بههیزن له ڕۆلگیران و تیکهڵبوون لهگهڵ چیرۆکی فیلمهکه، بۆیه ههر دیمهنیکی فیلمهکه به شیوهیهکی کاریگهر و ههست بزوین دهرهینراوه و وینهی گیراوه.

٣-فیلم وەك دروستبوونی واقیع وایە، یان بەرجەستەکردنی تێکستی نووسراوە، بەڵام نووسین زۆرکات تەنها لە بەرگی خەیاڵ دەمێنێتەوە.

٤-ئەوەی دەبینرێت زۆر ئاسانترە باسکردنی لەوەی کە دەخوێندرێتەوە، بۆیە پێناسەکردنی بینراو سەرەتاییترە لە نوسراو.

ئەو خوێندنەوەی بۆ فیلمەکەی دەکەین لە بنەمای چەند خاڵێکی فیکرییە کە تێبینیم کردوە تێیدا و هەوڵی شیکردنەوەیان دەدەم، لەم نێوەندەشدا بیری نووسەری ڕۆمانەکە دەخەمەڕوو و بەراوردی دەکەم لەگەڵ هەندێ بیرۆکەی تر. واتە : لە بنەمای فیلمەکەوە خاڵە فیکرییەکان پێناسە دەکەین و بیری نووسەر دەخەینەڕوو لە هەر وتەیەکی نێو فیلمەکە یاخود گفتوگۆیەك یان دیمەنێك، دوای خستنەڕووی بیرۆکەی نووسەر دەربارەی ئەو خاڵە دێین لە چەند ڕووێکی ترەوە پێناسەی دەکەین و لەگەڵ واقیع و چەند فیکرێکی تر بەراوردی دەکەین. بۆ هەر خاڵێکی فیکری، ناونیشانێك دادەنێین کە پێناسەی ئەو خاڵە فیکرییە بکات.

## خاڵی یەکەم :

## "دەروازەیەك بۆ پیشاندانی کاریگەری جوڵەی تاکێکی کۆمەڵگا لەسەردەمە جیاوازەکاندا"

دایڤد(نووسەری ڕۆمانی (Cloud Atlas) زمانی نووسینی ئەم ڕۆمانەی بە شێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش و لەسەرخۆ نووسیوە، بە شێوەیەك ئاگەداری هەر وشەیەك بووە کە نووسیویەتی. ئەو کاری لەسەر سێ کات کردووە بۆ نووسین بەڵام بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش و جیاواز. لە نووسین و تەنانەت لە فیلمیشدا کارکردن لەسەر سێ–کات کە بریتییە لە (ڕابردوو، ئێستا ، داهاتوو) کارێکی گرانە، چونکە زۆربەی ڕۆمانەکان لەسەر بنەمای (ئێستا، داهاتوو) دەنوسرێن، هەروەك زۆرینەی فیلمەکانیش هەروایە.

نووسینی ڕۆمان لەسەر سێ کات کارێکی گرانە و پێویستی بە هۆشیارییەکی زۆر و ئاگاداریەکی تەواو هەیە لە کاتی نووسیندا، گرنگی ڕۆمانەکەی دایڤد لەوە دەردەکەوێت کە ئەو نەك تەنها سێ کاتی بەکارهێناوە، بەڵکو لە هەر کاتێك لەوانە دوو سەردەمی تێدا دروستکردووە، بە واتایەکی تر لەبەر جیاوازی کولتور و شێوەژیانی مرۆڤەکان لە شەش زەمەنی جیاوازدا، بۆ هەر

یەکێکیان سەردەمێکمان داناوە. لە کاتی (ڕابردوو) دوو سەردەمی دروستکردووە و ساڵەکانی بەم شێوەیە دارشتووە : سەردەمی یەکەم : ساڵی ١٨٤٩ یە، سەردەمی دووەم : ساڵی ١٩٣٦ ە . بۆ کاتی (ئێستا) دوو سەردەمی تر بەم شێوەیە : سەردەمی سێیەم : ساڵی ١٩٧٣ یە ، سەردەمی چوارەم : ساڵی ٢٠١٢ یە. (ئەو لەبەر نزیکی هەڵسوکەوت و شێوە ژیان وپێشکەوتنەوە ساڵی ١٩٧٣ وەك کاتی (ئێستا) نیشانداوە لە پاڵ ساڵی (٢٠١٢) کە ئەو سەردەمەیە ئێمەی تێداین). بۆ کاتی (داهاتوو) بەم شێوەیە ساڵەکانی داناوە : سەردەمی پێنجەم : ساڵی ٢١٤٤ ە ، سەردەمی شەشەم : ساڵی ٢٣٢١ ە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەر کاتێك لەوانە (ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو) خاوەنی دوو سەردەمن، ئەو سەردەمانەش بەیەکەوە بەستراونەتەوە و پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە لەگەڵ ئەوەی هەر یەکێك لەم سەردەمانە خاوەن چیرۆکێکی تایبەتن، (جوڵەی هەر تاکێك لە سەردەمێکدا کاریگەرە لەسەر تاکی سەردەمەکانی تر). بەو واتایەی هەرچی دەگوزەرێ چ لە لایەن کۆمەڵێکەوە بێت یان لە لایەن تاکێکەوە بێت لە کاتی (ڕابردوو)، ئەوا کاریگەری درووست دەکات لەسەر کاتەکانی (ئێستا و داهاتوو).

ئێمە لێرە کە باسی فیلکەمە دەکەین، ئەوە لە هەمان کاتدا باسی ئەو ڕۆمانە دەکەین کە فیلمەکەی لەسەر دەرهێنراوە، نووسەر، بە شێوەیەکی زۆر جوان و بیرۆکەیەکی نویٚ ، ئەو شەش سەردەمەی بەیەك بەستۆتەوە ، ئەو بڕوای وایە هەر شتێك لە ڕابردوودا رویدابێت کاریگەری لەسەر ئێستا هەیە، بۆ نموونە ڕووداوێکی مێژوویی گەورەی نەتەوەیەك دەکریٚ کاریگەر بوبیٚ بەسەر خەڵکەکەی و کاریگەری هەبوبێت لەسەر ئەو جۆرە ژیانەی لە ئێستادا هەیانە. بۆ نموونە : لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم، بۆمبە ئەتۆمییەکەی ئەمریکا کە کێشای بە هیرۆشیما، گەورەترین ڕووداوی ئەوکاتە بوو، وایکرد سیستمی گشتی ئەو وڵاتە بە تەواوی بگۆڕێت. نەتەوەیەك بیری لای جەنگەوە بگۆڕێت بۆ پەروەردە! تەنها دەبیٚ ڕووداوێکی زۆر گەورە کاریگەری لەسەر هەبوبێت، خەڵکەکەی(یابانیەکان) خاوەن شێوە ژیانێکن کە تەواو جیاوازە لەوەی نیو سەدە پێش ئێستا هەیان بوو، هۆکارەکەشی ئەو ڕووداوە گەورەیە بوو (کارەساتی هیرۆشیما)، نەك تەنها ئەوەش، بەڵکو لە ئێستادا یابان وڵاتێکە کاریگەری لەسەر سەردەمی ئەمڕۆماندا لە ڕووی سیاسی و تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنەوە زۆرە، بۆیەش جار جار یابانیەکان دەڵێن کارەساتی هیرۆشیما چەندە کاولکاری بوو بۆ ئێمە هێندەی ئەوەش خاڵێکی گرنگ بوو بۆ هەڵسانەوەی

نەتەوەکەمان. وەك (دایساکو ئیکیدا)، ڕابەری بزووتنەوەی دینی سۆکا گاکایی یابانی لە وتارێکی دەڵێت: یابان لە هیرۆشیما و ناگازاکییەوە فێربوو کە ئەو تراژیدیایەی بەهۆی بۆمبی ئەتۆمییەوە دروستبوو، هەرگیز نابێت دووبارە بێتەوە، مرۆڤایەتی و چەکی ئەتۆمی هەرگیز هاوبوون نابن.[٦]

لە (Cloud Atlas)، ئەوە زۆر بەوردی پێشاندراوە و پێناسەکراوە، نووسەری (Cloud Atlas) پێی وایە: نەوەك ڕووداوی گەورە، بەڵکو جوڵەی هەر تاکێك کاریگەرە لەسەر بیرکردنەوە و گۆڕانی تاکێکی تری کۆمەڵگا لە داهاتوودا، ئەو پێی وایە بیرکردنەوەی تاکەکان لە گۆڕاندایە دەربارەی ڕووداوەکان، بۆ نموونە لە (Cloud Atlas) دەبینین کاتێك لە سەردەمێك کە ساڵی (٢٠١٢)یە، چۆن نووسەرێك لەبەر ئەوەی ڕەخنەگرێك گاڵتە بە بەرهەمەکەی دەکات دەیکوژێت، پاشان وەك پاڵەوانێك سەیر دەکرێ و لە داهاتوودا کتێب و نووسراوەکانی خوێنەری زۆری دەبێت. لێرەدا نووسەر دەیەوێت بڵێت کەوا کۆمەڵگا خۆی هەڵدەبژێرێ کە چ شتێك دەبێتە عەیبە یاخود چ شتێك بە تاوان هەژمار دەکرێت، واتە ئەگەر سەد ساڵ بەر لە ئێستا تۆڵەسەندنەوە بە کوشتن کارێکی ئاسایی بوو، ئەوە ئەمڕۆ بە هەموو پێوەرێك تاوانە و تەنها دەبێ دادگا بڕیاری لەسەر بدات هەروەها وەك لە عادەت و تەقالیدی کۆنی ئێمەدا باوبووە (کوشتن لەسەر

شەرەف) ئەوە ئەمڕۆ تاوانێکی گەورەیە و تەنها دادگا دەبێت بڕیار بدات.
هەر تاکێك کە هۆکارە بۆ ڕووداني ڕووداوێك لە سەردەمێکی کۆندا، کاریگەری ئەو ڕووداوە لە سەردەمەکانی تر دیار دەبێت. ئەو پێی وایە گشت ئەوانەی لە ئێستادا ڕوو دەدەن، دەرئەنجامی ئەو شێوەژیانەن کە تاکەکانی کۆمەڵگا لە سەردەمەکانی ڕابردوو هەیانبووە. بۆیە بە پێی ئەو بیرۆکەیەی نووسەر بێت ئەوە دەتوانین نموونەیەك بهێنینەوە و بڵێین: ئەگەر ١٠ ساڵ بەر لە ئێستا یاریزانی تۆپی پێ (لیۆنێل میسی) وازی لە یاری تۆپی پێ بهێنایە یاخود هەر ئەسڵەن نەیکردبایە، ئەوا یاری تۆپی پێ لە ئاستێکی نزمتر دەبوو لە ئێستادا، یاخود خولی ئیسپانی لەسەرووی خولەکانی تری تۆپی پێ نەدەبوو، ئەگەر گەورەتر بڕوانین دەتوانین بڵێین کەوا وڵاتێکی وەك ئەرجەنتین (کە شوێنی لە دایك بوونی یاریزانەکەیە) گۆڕانکاریەکی وای بەخۆیەوە نەدەبینی کە ئێستا وایە بەهۆی یاریزانەکەوە، گۆڕانکاریەکانیش نادیارن، واتە ئێمە نازانین چ شتێك لە ئێستادا بەهۆی چ کەسێکەوە لە ڕابردوودا دروستبووە.
ئەگەر چەند قسەیەك لەسەر ئەم بیرۆکەیەی نووسەر زیاد بکەین، ئەوا دەبێ بڵێین: نووسەر ئەم کاریگەریەی تاکی بە شێوەیەکی تایبەتی دارشتتووە، واتە لە فیلمەکەدا کاریگەری ڕووداوەکانی لە چەند کەسێکی دیاری نێو

فیلمەکە بچوک کردۆتەوە. نووسەر دەیەوێت بڵێت کە تەنها ئەوانەی خاوەن هێز و کاریگەری و هەوادارن دەتوانن گۆڕانێك لە داهاتوو درووست بکەن. بەڵام ئەوە مەرج نیە، پێموایە گۆڕانکاریەکانی ئەم جیهانە بە گشت ئەوەی تیایدایە بەستراوەتەوە، ڕاستە مرۆڤەکان درووستکەری ڕووداوەکانن بەڵام لە هەمان کاتدا زیندەوەرەکانیش هۆکاری ڕووداوەکانن، بۆ نموونە مێشەنگینێك کاتێك بە مرۆڤێکەوە دەدات، زیانی جەستەیی لێدەدات، ئەو ئازارەی مرۆڤەکە دەیبینێت ڕەنگە مرۆڤەکە بەرەو ڕوودانی شتانێکی تر ببات. جگە لەوە سروشتیش ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە دروستبوونی ڕووداوەکان. کارەساتە سروشتییەکان بۆ نموونە، ئەوان توانای گۆڕانکاری گەورەیان هەیە لە شێوەژیانی مرۆڤدا. بۆیە ئەم باسە زۆر گەورەترە لەوەی تەنها بە مرۆڤی ببەستینەوە، گەر من ئێستا ئەم کتێبە چاپ بکەم، توانای دروستبوونی گۆڕانکاریەکم هەیە لە داهاتوودا، ئەگەر نەمتوانی چاپی بکەم، ئەوا ئەم گۆڕانکاریە لە داهاتوودا درووست نابێت و هەر بوونی نابێت.

مرۆڤەکان درووستکەری ڕووداوەکانن، بەڵێ ڕاستە، بە تایبەت جوڵە و بزووتنەوەکان، نووسەر دەیەوێت بڵێت کەوا هەر جوڵەیەکی کۆمەڵە مرۆڤێك کە هەڵگری جۆرە بیرکردنەوەیەکن توانای گۆڕانکاری گەورەیان هەیە لە داهاتوودا. لە کاتی (داهاتوو) سەردەمی پێنجەم کە دەکاتە ساڵی (٢١٥٥)

لە فیلمەکە، لە کاردانەوە بۆ ئەو نادادپەروەریەی بەدی دەکرێت لە کۆمەڵگادا، کۆمەڵەیەك دروستبووە بە ناوی (یاخیبووانی یەککرتوو-Union Rebellion) کە هەوڵ بۆ دەستەبەرکردنی ئازادیەکانی تاك دەدەن و لەم پێناوەشدا ئامادەن ببن بە قوربانی و تاکە هیواشیان بۆ سەرکەوتنی بیرۆکەکەیان کچێکە بە ناوی (سۆنمی-sonmi) کە ئەویش کاریگەر بووە بە دیمەنێك لە فیلمێکی سینەمایی کۆن کە تێیدا پیاوێك دەڵێت: من ملکەچی خراپ مامەڵەکردنی تاوانبارانە نابم( I will not be subjugated to criminal abuse). کە ئەم فیلمەش لە ڕوانگەی ژیانی نووسەرێکەوە دەرهێنراوە لە کاتی (ئێستا) و ساڵی (٢٠١٢)ی فیلمەکە چیرۆکەکەی باسکردووە. بەهۆی ئەم کۆمەڵەیەوە توانرا (سۆنمی) بگات بە شوێنی مەبەست و لەوێوە پەیامەکەی بگەیەنێت کە دواتر تەنانەت کاریگەری لەسەر گۆڕانی گشت دونیا هەبوو و مرۆڤ پاش دوو سەدە (سۆنمی)یان وەك خودا دەپەرست(لە بابەتەکانی داهاتوو بە تایبەتی باسی ئەوە دەکەین) . لە باسی دوو سەردەمەکەی تری داهاتوو شتێك زۆر بە ڕوونی دەبینین، ئەویش ئەوەیە کە نووسەر پێشبینی خۆی بۆ داهاتووی مرۆڤایەتی نیشانداوە لەو دوو سەردەمەی داهاتوو، یەکێکیان کە ساڵی ٢١٤٤ ە، جیهان پێشکەوتنێکی یەکجار گەورەی پێوە دیارە، ئەو

پێشکەوتنە گشتی لە سەردەمەکەی تری داهاتوو کە ساڵی ٢٣٢١ ە لەناو چووە. لە کاتی (داهاتوو) و سەردەمی شەشەم، نووسەر پیشانی دەدات کە مرۆڤ لە نێوان دوو جیهان دەژێت، جیهانێك لەسەر زەوی کە وێران کراوە بەهۆی چەند ڕووداوێك کە پیشان نەدراوە لە فیلمەکە جیهانێکیش کە مرۆڤ ئەوەندە پێشکەوتوو بووە توانیویەتی بگات بە سەر هەسارەکانی تر و لەوێ دەست بە ژیان بکات. ئەو جیهانەی سەر زەوی هەر لە چاخە کۆنەکان دەچێت لە ساڵی (٢٣٢١) کە سەردەمی شەشەمە بەهۆی وێران بوونیەوە، لێرە دەتوانین بڵێین کە ئەو ڕووداوەی وایکردووە زەوی وای لێبێت جەنگ بووە، چونکە لە سەردەمی پێنجەم کە ساڵی (٢١٤٤) دەکات، جۆرێك لە جەنگ بەڕێوەبوو لە نێوان کۆمەڵەی (یاخیبووانی یەکگرتوو) و دەسەڵاتی ئەو وڵاتە کە دواتر بۆتە جەنگێکی جیهانی و بەهۆیەوە پەلیکێشاوە بۆ وێرانبوونی زەوی بە تەواوی. ئەو بیرۆکەیە، وتەیەکی (ئاینیشتاین)مان بیردەخاتەوە کاتێك دەڵێت: "من نازانم لە جەنگی جیهانی سێیەم مرۆڤ چ جۆرە چەکێکی گەورەی هەیە بۆ لەناوبردنی یەکتر، بەڵام دەزانم کە جەنگی جیهانی چوارەم مرۆڤەکان بە دار و بەرد دەجەنگن".[٧]

ئاینیشتاین ئەوەمان بیردەخاتەوە کە یەکتر لەناوبردن، لە هەمان کاتدا لەناوبردنی پێشکەوتن و شارستانیەتەکانی مرۆڤە، ئەوەی لە کاتی داهاتووی

سەردەمی شەشەم پیشان دەدات هەمان ئەم قسەیەی ئاینیشتاین مان بیردەخاتەوە، بەلاّم نووسەر لێرە خەیاڵێکی زانستی تری تێکەڵکردووە. ئەو، ئەو خەیاڵەی تێکەڵکردووە کە مرۆڤ ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتوانێت لەسەر هەسارەیەکی تر ژیان بباتە سەر و شارستانیەت لەوێ پێك بهێنێت و زیندووی بکاتەوە، بۆیە ئەو جیهانەی تر کە لە سەردەمی دووەم دەیبینین بریتییە لەو شارستانیەتەی کە دوور لە زەوی پێکەێنراوە، کاتێك مرۆڤێك لەوێوە دێتە سەر زەوی بۆ لێکۆڵینەوە و گەڕان بەدوای شوێنەوارەکان، بە ڕوونی دەبینین لە سەردەمی شەشەم کە ساڵی ٢٣٢١ ە، مرۆڤ بۆ دوو جیهان و شێوە ژیان دابەش بووە، شێوەژیانێك کە پێمان دەڵێت کۆتایی مێژووی مرۆڤایەتی بریتییە لە دووبارە بوونەوەی هەمان مێژووی خۆی کاتێك دەبینین مرۆڤەکان لەم سەردەمە (ساڵی ٢٣٢١) وەك مرۆڤە سەرەتاییەکان ڕاودەکەن و نان دەخۆن و بیردەکەنەوە و مرۆڤێکی پێش خۆیان دەپەرستن وەك ئەوەی رزگارکەری ئەوان بوبێت و جۆرێك بێت لە هێزێك کە دووریان دەخاتەوە لە خراپە. لە خاڵەکانی تردا باسی مرۆڤپەرستی دەکەین. شێوەژیانێکی تریش کە پێمان دەڵێت مرۆڤ دەتوانێت شارستانیەتێکی تر پێکبهێنێت لەسەر هەسارەی تر جگە لە زەوی.

## خاڵی دووەم :

## "مرۆڤپەرستی: دیدگایەك بۆ سەرچاوە و هۆکاری پەیدابوونی"

یەکێکیتر لە خاڵە دیارەکانی (Cloud Atlas) کە لە کاتی سێیەم (داهاتوو)، سەردەمی شەشەم ساڵی (٢٣٢١)، هەستی پێدەکرێت بریتییە لەوەی جۆرێك لە مرۆڤپەرستی دروستبووە لە نێو ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لەسەر زەوی ماونەتەوە. زەکەریا(زاکری–Zachry) یەکێکە لەو کەسانەی باوەڕی وایە دوو هێز هەیە کە یەکێکیان شەیتانە و هەوڵی خراپە دەدات بە ناوی (جیۆرجی)، ئەوەی تریشیان رۆحێکی خواییە بە ناوی (سۆنمی– Sonmi ) و شایەنی پەرستنە، کە وتەکانی هۆکاری ئارامی و رێنیشاندەری مرۆڤن. لە بابەتی یەکەم دەربارەی کاریگەری تاك لە سەردەمە جیاوازەکان باسمان کرد کە چۆن دەکرێ کەسێك کاریگەری لەسەر داهاتووی کۆمەڵگایەك هەبێت، ئەی ئەگەر ئەو کەسە بەشداربێت لە بزووتنەوەیەکی گەورەدا دژ بە کۆیلایەتی و چەوساندنەوە و چینایەتی؟ ئەوە دوورنیە رێڕەوی جیهانیش بگۆڕێت.

لە کاتی سێیەم(داهاتوو) و سەردەمی پێنجەم کە دەکاتە ساڵی (٢١٤٤)، (سۆنمی) ئەو کچە خزمەتکارەیە کە لە لایەن کۆمپانیایەکی

گەورەوە بەرهەم هاتووە(ڕەنگە مەبەست لێرەدا کۆپی بوونی مرۆڤ بێت) و بەخێوکراوە تا لە ڕێستورانتێك خزمەتکاری بکات لەگەڵ چەند کچێکی وەك خۆی، کاریان بریتییە لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەو کەسانەی سەردانی ڕێستورانتەکە دەکەن، دواتر خواردنی سوپێك کە هۆکارە بۆ خەوتنی ئەوان و هەڵسانەوە دوای خەوتن بۆ دووبارە کارکردن، بێ بینینی هیچ شتێك جگە لەو کەسانەی کە خزمەتیان دەکەن و ئەو ڕێستورانتە، لەم نێوەندەدا هاوڕێیەکی سۆنمی کە کەمێك لەوانەیتر کراوەترە و جۆرێك لە بیرکردنەوە بۆی دروستبووە دەربارەی ئەوەی کە ئەوان لەم شوێنە بەندکراون و پێویستە هەوڵی خۆرزگارکردن بدەن، بە جۆرێك کاریگەری لەسەر سۆنمی درووستکرد. دوای هەوڵێك بۆ هەلاتن، هاوڕێکەی سۆنمی دەکوژرێت، بەلام سۆنمی تێگەیشت کە ئەوانیش دەتوانن وەك مرۆڤەکانی تر بژین و ڕۆژێك بێت لەم ڕێستورانت و خزمەتکردنە بێنە دەرەوە. دوای ڕزگارکردنی سۆنمی لە لایەن یەکێك لە ئەندامانی (یاخیبووانی یەکگرتوو- Union Rebellion)، سۆنمی زۆر شتی لێوە فێردەبێت، دواتر چاوی بە سەرۆکی ئەو بزووتنەوەیە دەکەوێت و لەوێ لێی دەپرسێت کە کاریان بە ئەو چییە، سەرۆکی بزووتنەوەکە(یاخیبووانی یەکگرتوو- Union Rebellion) پێی دەلێت کە ئەو دەتوانێت جیهان بگۆڕێت، جیهان بکات

بە شوێنێکی باشتر. لێرەدا کاریگەری تاك لەسەر کۆمەڵگا لە داهاتوو زۆر بە ڕوونی دیارە. بەڵام هێشتا سۆنمی تێناگات لە مەبەستی سەرۆکەکە، بۆیە داوا لەو کەسەی لەگەڵ سۆنمی دایە دەکات کە بیبات بۆ ئەوەی ڕاستی بوونی سۆنمی پیشان بدات، کاتێك سۆنمی بۆی دەردەکەوێت کە ئەو مرۆڤێکی ئاسایی نیە، بەڵکو پرۆگرام کراوە و دروستکراوە، هەروەها ئەگەر بێتوو بەردەوامبووبا پاش چەند ساڵێك کارکردن لە ڕێستورانتەکە دەکوژرێت بە شێوەیەکی شاراوە و لاشەکەی دەکرێت بە سوپ لە لایەن کۆمپانیاکەوە، ئینجا زیاتر سووردەبێت لەوەی کە پێویستە ئەوەی بزووتنەوەکە خەریکیەتی و پلانی بۆ داناوە سەرکەوتوو بێتو ئەو سیستمە بڕوخێنێت کە مرۆڤ بۆ خزمەت و مەبەستە مادییەکانی چەند کەسانێك بەکاردەهێنێت.

سۆنمی ڤیدیۆیەکی خۆی ڕیکۆرد دەکات کە تێیدا وتەکانی خۆی و باسی خۆی تێدا کردووە، دوای چەندین ساڵ لە مردنی سۆنمی، ئەوەی کە ئەو دەیگوتەوە لە ریکۆردەکە، بوو بە شۆرشێك دژی ئەو سیستمەی دروستکەری کۆیلە و قەدەغەکردنی ئازادی بوو، سۆنمی وەك هێمایەکی ئازادی مرۆڤ مایەوە، پاشان دوای وێرانبوونی زەوی، لە مرۆڤێکەوە گۆڕا بۆ ڕۆحێکی خوایی کە کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر زەوی دەیپەرستن.

مرۆڤپەرستن، لە خۆشویستن و گەورە نیشاندانێکی یەکجار زۆری مرۆڤێکەوە درووستدەبێت بۆ مرۆڤێکی تر، جا ئایا ئەو خۆشویستنە لە بنەمای وتەکانی ئەو مرۆڤەوە بێت، یاخود لە شێوەژیانی. ئەوە بە شێوەیەکی گشتی لە چاخە کۆنەکان باوبوو، بەلآم تەنانەت لە ئێستاشدا بوونی هەیە لە دینی بودی(Buddhism)، بودییەکان کەسایەتی گەوتاما بودا(Gautama Buddha) بە کەسایەتیەکی رۆحی گەورە دادەنێن و شوێنکەوتووی شێوەژیان و ئاکار و وتەکانی ئەون، تەنانەت دەیپەرستن. بڕواگەلێکی سەیر لە دینەکەیان هەیە، بۆ نموونە بڕوایان وایە شتێك نیە بە ناوی خودا و ئەم جیهانەش بەهۆی ئەڤیدیا (نەزانین)ەوە دروستبووە و بەهۆی پەرستش و زانست و کردەوەکانی بودا پاك دەبێتەوە. بودا گەورەترین شتێکە بۆ ئەوان، بۆیە پەرستنی ئەرکێکە لایان. ئەگەر بپرسین لەگەڵ ئەو هەموو زانست و هۆکارە بۆ ناسینی دینەکانی تر و دۆزینەوەی سەرچاوەی زیاتر بۆ دۆزینەوەی خودایەکی (واقعی) تر و گونجاوتر، بۆچی بودایی چوارەم دینی جیهان پێکدەهێنێت؟ ئەوە وەلآمەکەی ئاسانە، چونکە ئەوان لەگەڵ خەڵکێك دەژین کە بودا دەپەرستن، منداڵەکانیان لە دایك دەبێت، فێری پەرستنی بودا دەبن، کە گەورە دەبن هیچ ویست و ئارەزوویێك نامێنێتەوە بۆ وەرگرتنی دینێکی تر جگە لەوەی خۆیان، جگە لەوەش کە

ئێستا دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی ڕۆژئاوا بەرەو دینی بودی هەنگاو دەنێن، بە تایبەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەوەش وەك (کێنێپ تاناکا) لە وتارێکیدا بە ناوی (گەشەی دراماتیکی بودیزمی ئەمریکی: دونیابینییەکی گشتی) یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم گەشەکردنەی بودیزم لە رۆژئاوا بە گشتی و ئەمریکا بە تایبەتی دەگەڕێنێتەوە بۆ بوونی فەلسەفەیەکی تاکی بەهێز و بەهێزی لایەنی ڕۆحی لە بودیزمدا.[٨] دوو ساڵ بەر لە ئێستا لەگەڵ هاوڕێیەکی ڤێتنامیم باسی دینی بودیمان دەکرد، ئەو خەریك بوو بۆی باسدەکردم و منیش پرسیارم لێی دەکرد، پێم گوت ئێوە بودا دەپەرستن ڕاستە، گوتی بەڵێ، گوتم ئەی بودا مرۆڤ نەبووە وەك من و تۆ، گوتی بەڵێ، گوتم یانی ئێوە مرۆڤێك دەپەرستن (ئەم گفتوگۆیە وەك جۆرێك لە لۆجیکی کۆنی لێهات)، گوتی بەڵێ، ئینجا گوتی ئەی تۆ، منیش گوتم کەسێك کە تەنانەت مرۆڤ و ئەم گەردونەی دروستکردووە، ئیتر دوای کەمێك باسکردن لە خودا، پێم گوت کە ئەم شتانە دەزانیت بۆچی نابیت بە مسوڵمان یان کریستیان کەوایە، گوتی ئەگەر بشمەوێت ناتوانم دینی خۆم بگۆڕم، چونکە ئەوە دینی باوك و باپیرانمە. مرۆڤەکان تا هۆکارێکی گەورەتر لە دەوروبەر نەدۆزنەوە کە کار لەسەر بیرکردنەوەیان بکات، ناتوانن رزگاریان بێت لەدەست بیرکردنەوەی ئەو کۆمەڵەی لەگەڵی دەژین.

ئەوەی دایڤد(نووسەری Cloud Atlas) سەرەتا پیشانی داوە بریتییە لەوەی مرۆڤپەرستی لە ڕێگای نەزانینەوەیە، ئەوەش ڕوونە کاتێك دەبینین زەکەریا (ئەو کەسەی سۆنمی دەپەرست لە سەردەمی شەشەم) دوای ئەوەی یارمەتی کەسێکی سەر هەسارەیەکی تر دەدات (کە سەردانی زەوی کردووە) بۆ ئەوەی بگات بە شوێنێکی بەرز و ناردنی پەیامێك بۆ خەڵکانی سەر هەسارەکەی ئەو، زەکەریا یارمەتی دەدات و دەگەن بە شوێنەکە، لەوێوە ئەو کەسەی لەگەڵ زەکەریایە، بە زەکەریا دەڵێت کەوا ئایا ئامادەیە ڕاستی باوەڕەکەی بزانێت، ئەویش دەڵێت بەڵێ، پێی دەڵێت کەوا ئەو کەسەی تۆ دەیپەرستی (سۆنمی) تەنها مرۆڤێك بووە دوو سەدە بەر لە ئێستا ژیاوە نەوەك رۆحێکی خوایی یان شتێکی تر، بێگومان ئەوە بۆ زەکەریا هەواڵێکی ناخۆشە بەڵکو جێگای شۆك بوونە، دوای دەیان ساڵ لە پەرستنی کەسێك یاخود دوای سەدان ساڵ پەرستنی لە لایەن باو و باپیرانی دوایی پێی بوترێ کە خوداکەت تەنها مرۆڤێك بووە وەك ئێمە، پاشان پەیامەکەی سۆنمی لە ریکۆردەکە نیشان دەدات تا ئەوەی ئارام بێتەوە و باوەڕی پێبکات. جیاوازی بودا و سۆنمی لێرەدا ئەوەیە، کە بودا هیچ بۆشاییەکی گومانی لە باوەڕەکەیدا نەهێشتۆتەوە، بەو واتایەی لە باوەڕەکەیدا بوونی خودا هەر ڕەتدەکاتەوە و شوێنکەوتووانی لەو پرسیارە

رزگار دەکات و پێی وابووە خودا هیچیتر نییە جگە لە دروستکراوێکی ترسی مرۆڤ، دینەکانی تریش بە هەمان شێوە. لە بەرامبەردا سۆنمی تەنها پەیامێك بوو کە نەوە دوای نەوە گەورەترکراوە تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی پێی بوترێ خودا و بپەرسترێ. بودا شێوەژیانی شوێنکەوتووانی دیاریکردووە، بەڵام سۆنمی نا، کە ئەوەش خاڵێکی لاوازە بۆ شوێنکەوتووانی سۆنمی تا بتوانن بە ئاسانی واز لە پەرستنی بهێنن.

ئەوەی دایڤد دەیخاتەڕوو لێرەدا، بریتییە لەوەی کە تەکنەلۆژیا و زانست توانای پیشاندان و سەلماندنی ڕاستییەکانی هەیە، ڕاستی سۆنمی بەهۆی تەکنەلۆژیاوە بە زەکەریا گەیشت چونکە وتەکانی ریکۆرد کردبوو کەچی بەهۆی وێرانبوونی زەویەوە نەیتوانیبوو ببیبنێت. بەڵام هەمان شت بۆ بودا نەکراوە، بۆیە شوێنکەوتووانی بەردەوامن لە پەرستنی لە کاتێکدا لە جیهانێکی تەواو پێشکەوتوو لە تەکنەلۆژیا دەژین. جگە لەوەش کاریگەری دەوروبەر لەسەر دین خاڵێکی زۆر گرنگە، زەکەریا و خەڵکەکەی وەك تاکە رزگاربویەکی سەر زەوی وابون، کەسێك نەبوو خاوەن باوەڕێکی تر بێت لەوەی ئەوان و سۆنمی نەپەرستێت، تا ئەو کاتەی مرۆڤێك لەسەر هەسارەیەکیتر هاتە سەر زەوی و ڕاستیەکانی بە زەکەریا گوت. لێرەدا دەتوانین بڵێین بە جۆرێك هەمان شت لەگەڵ بودییەکان ڕودەدات، ئەوان ئەو

دەوروبەرەی تێیدا دەژین هەمووی خاوەنی بیروباوەڕی بودین، لە چەند وڵاتێکیش لەگەڵ شوێنکەوتووانی دینی تر دەژین وەك هیندۆسیەکان و مەسیحیەکان، بەڵام ئەوانە هەرەشە نین لەسەر باوەڕەکەیان هێندەی مسوڵمانان هەرەشەن. لەم چەند ساڵەی دوایی هەڵمەتێکی گەورە دەستپێکرد لە بورما(میانمار) لە کوشتنی مسوڵمانەکان لە لایەن بودییەکانەوە، بە شێوەیەك زۆر بە کەمی ڕێگا بە میدیا دەدرا پەخشی بارودۆخەکە بکات، هۆکاری کوشتارگەکەش نەتوانرا بزانرێت، بەڵام گەر بەم لێکدانانەوانەی سەرەوە بێت، دەتوانین بڵێین بوونی مسوڵمانەکان هەرەشەی درووستکردبوو لەسەر بیرو باوەڕی بودییەکان، چونکە دونیابینی و پەرستشەکانی مسوڵمانەکان بە شێوەیەکی یەکجار گەورە کاریگەرتر و باوەڕپێهێنەر(مقنع) ترە لەوەی کە بودییەکان هەیانە، دینی بودی لە مەترسیدا بوو، لێرەدا مەبەستم سوکایەتی نیە بەڵام چونکە کەسێکی خاوەن ئەو بیروباوەڕە بچوکە(پەرستنی مرۆڤ(بودا)) هەرەشەی لەناوچوونی لەسەرە بەبەراورد لەگەڵ بیروباوەڕێکی تۆکمە و گەورەی وەك باوەڕی مسوڵمانان، ئەم ڕووداوانەی لێدەکەوێتەوە. دایڤد، مرۆڤپەرستی دەستنیشانکردووە بەوەی لە ڕێگای نەزانینەوەیە و باوەڕێکە خاوەن بنەمایەکی لاوازە، ئەوەش لە ڕۆمانەکەی زۆر بەڕوونی دیارە.

## خاڵی سێیەم:

## "دیارەدەی دێژا ڤو (Deja Vu) وەك پێناسەیەك بۆ بەرجەستەبوونەوە "

یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی (Cloud Atlas ) کە نووسەر زۆر جەختی لێکردۆتەوە و هەوڵیداوە بەهۆی ئەم ڕۆمانەیەوە هۆکار و چۆنیەتی دروستبوونی بخاتەڕوو، بریتییە لە دێژا ڤو، (دێژا ڤو) وشەیەکی فەرەنسییە بۆ دیاردەیەك کە پێشتر بینرابێت یاخود هەستی پێکرابێت، بۆ نموونە: زۆر جار کاتێك بۆ شوێنێك دەچین یاخود کاتێك کە ڕووداوێك دەبینین، یان قسەیەك دەبیستین، هەستدەکەین گشت ئەوانە پێشتر ڕوویانداوە لە ژیانماندا، دوای ئەو هەستە وەك بڵێی توانای ئەوەمان هەیە پێشبینی داهاتووی ڕووداوەکەش بکەین.

زانای سایکۆلۆژی، (ئێدوارد تیچنێر)ی بەریتانی لە کتێبەکەیدا بە ناوی ( کتێب-تێکستێك لە سایکۆلۆژی) کە ساڵی ١٩٢٨ ١٩٠٩ بڵاوبۆتەوە، ئەو دیاردەیە بۆ هۆکاری ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە مرۆڤ دەکرێ سەرنجێك لە کارەکانی داهاتووی وەربگرێت پێش ئەوەی مێشکی پێی بزانێت و لێکی بداتەوە و تەواوکاری کارەکەی بکات.[٦] بەڵام ئەو بیرۆکەیەی ئێدوارد دوای

ساڵانێك ڕەتكرایەوە بەهۆی ئەوەی كەوا دێژا ڤو ناكرێت جۆرێك بێت لە زانستێكی غەیبی كە بە مرۆڤ بگات پێش ئەوەی ڕووبدات و بێتە واقیعەوە چونكە زانست شتێكە و كردەوەیەكی پێناسە بۆ نەكراوی وەك دێژا ڤو لە ڕووی زانستییەوە شتێكی ترە.

زۆرێك لە زاناكان خەریكی لێكدانەوەی بوون، هەندێكیان گوتیان بریتییە لە جێگیر بوونی ڕووداوەكان لە مێشكی مرۆڤ بەڵام بێ وەرگرتنی زانیاری و چۆنیەتی لەسەر ڕووداوەكە، بەڵام دوای ماوەیەكی تریش ئەو تیۆرە بە ناڕاست دانرا، كاتێك گوتیان مێشك ناتوانێت هیچ شتێك وەربگرێت بەبێ هەبوونی پێشینەیەك یاخود هۆكارێك بۆ وەرگرتنی. هەرچۆنێك بێت، تا ئێستا بیروبۆچوونەكان دەربارەی جیاوازن. بەشێك لە زانا پاراسایكۆلۆجیەكان دێژا ڤو بۆ بەرجەستەبوونەوە دەگەڕێننەوە و پێیان وایە تەنها پێناسە بتوانرێ بۆ دێژا ڤو بكرێت بریتییە لە بەرجەستە بوونەوە.

بەرجەستەبوونەوە(Reincarnation): بە واتای دووبارە جەستەوەرگرتنەوەی ڕۆحی مرۆڤ دێت دوای مردن، واتە مرۆڤێك دوای مردنی و تێكچوونی جەستەی و ڕۆشتنی ڕۆحی، دەتوانێت دووبارە لە جەستەیەكی تر بێتەوە ژیان، جا ئاخۆ ئەو جەستەیە، جەستەی مرۆڤ بێت

یاخود گیانلەبەر ئەوەش پێی دەگوترێت (Reincarnation)، بە کوردیەکەی بەرجەستەبوونەوە. بەرجەستەبوونەوە پێش ئەوەی چەمکێکی زانستی و فەلسەفی بێت، بنەمایەکی دینی هیندۆسیە، حەتمەن هەموویان نا، بەڵام بەشێکی زۆری هیندۆسیەکان جیاواز لە هەر شوێنکەوتووانی دینی تر، پێیان وایە جگە لەم ژیانەی سەر زەوی(ئێستا) ژیانێکی تر دوای مردن بونی نیە و مرۆڤ دوای مردنی دووبارە لە جەستەی گیانلەبەرێکی تر دێتەوە دونیا و ئەو جەستەیەی دوای مردنی دەستی دەکەوێت پەیوەستە لەسەر ئەو جۆرە ژیانەی هەیبووە پێشتر، کە ئاخۆ لە پلەیەك بووە شایەنی ئەوەبێت دووبارە دوای مردنی وەك مرۆڤ بێتەوە ژیان یاخود بچوکتر لە مرۆڤ ژیاوە و دوای مردنی ڕەنگە وەك پشیلەیەك بۆ نموونە بێتەوە ژیان.

لەم سەدەیەی ڕابردوودا، ئەو بیردۆز و بنەما دینییە، گرنگیەکی زۆری پێدرا و تەنانەت چەندین کتێبی لە بارەوە نوسرا و چەندین گۆرانی و فیلمی لەسەر دەرهێنرا، بە شێوەیەك ئێستا ئەم تیۆرە لای وڵاتانی وەك سربیا، باکوری ئەمریکا، ئوسترالیا و ئەفریقیا باوە و شوێنکەوتووی زۆری هەیە. تەنانەت لە یۆنانی کۆندا گرنگیەکی زۆری هەبووە، ئەوەتا ئەفلاتوون لە چیرۆکێکی بە ناوی (ئەفسانەی ئار-Myth of Er) لە کتێبی (کۆمار) لە زۆر شوێندا باسی ژیانی دوای مردن و بەرجەستەبوونەوەی کردووە.

ئەگەر بەو شێوەیە بێت کە باسمانکرد ئەوە دەتوانین بڵێین کە نووسەری (Cloud Atlas) هەمان بڕوای هەبووە بەرامبەر بە دێژا ڤو وەك ئەنجامێك لە بەرجەستەبوونەوەی مرۆڤ، واتە : ئەو پێی وایە کە کاتێك دێژا ڤو لای مرۆڤێك ڕوودەدات ئەوە هۆکاری ئەوەیە کە ئەو کەسە پێشتر و لە ژیانێکی تر ئەو ڕووداوە یاخود ئەو شوێنەی بینیوە.

بڕوای بەرجەستەبوونەوە، وەك دینێکی ئاڵۆز زۆر لقی لێبۆتەوە، بە شێوەیەك تەنها بنەمایەك هەیە بۆی ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ دوای مردن دەگەڕێتەوە ژیان، بەڵام هەموو ئەوانەی بڕوایان پێی هەیە هاوڕا نین لەوەی کە ئایا ئەو کەسەی دێتەوە ژیان دووبارە لە چ بنەمایەکەوە جەستەی ژیانی داهاتووی وەردەگرێت، ئایا تەنها بەوەی کە کەسێکی چاکەکارە جەستەی مرۆڤێك وەردەگرێت یان ئایا دەکرێ تەنها جەستەی مرۆڤ وەرگرێ و ئاژەڵیش جەستەی ئاژەڵ وەربگرێت؟ هەر کامێك لەوانە بێت، دایڤد (نووسەری (Cloud Atlas) ) پێی وایە هەموو مرۆڤێك دەتوانێت جەستەی هەر مرۆڤێکی تر وەربگرێت لە داهاتوودا و مرۆڤ تەنها شایەنی ئەوەیە جەستەی مرۆڤ وەربگرێت یاخود دووبارە بە لاشەیەکی مرۆڤەوە بەرجەستەبێتەوە. دایڤد لە (Cloud Atlas) گشت ئەو دیمەنانەی وەك دێژا ڤو نیشانی داون لە لایەن کاراکتەرەکانەوە، هێمایەك لە لەشیان هەیە

هۆکاره بۆ بەرجەستەبوونەوەی کاراکتەرەکان لە سەردەمە جیاوازەکان، واتە : گەر لە ساڵی ١٩٣٦ کەسێك بە ناوی (رۆبێرت فرۆبیشەر) هێمایەك لە جەستەی هەبێت و دوای مردنی، ساڵی ١٩٧٣ بە لاشەی کەسێکی تر بە ناوی (لویزا رێی) بەرجەستەبوبێتەوە و بەو هێمایەی لاشەی بناسرێتەوە، هەمان رۆحی ئەو کەسەیە و بەرجەستەبۆتەوە لە لاشەیەکی تر بەڵام نایزانێت (لە فیلمەکە) ، تەنها ئەوە نەبێت کە جار جار بەهۆی دێژا ڤو شوێن و دیمەن و ڕووداوەکان هەست پێدەکات وەك ئەوەی پێشتر بینیبێتی، ئەوەش بەهۆی ئەوەی پێشتر لە جەستەی (رۆبێرت فیشەر)ەوە بینیویەتی. دایڤد ، یەکێکە لەوانەی ئەوە بڕواکەیەتی بەرامبەر دێژا ڤو، دەکرێ ئەوە بۆ ئەمریکی بونی ئەو بگەڕێتەوە ، دەکرێ ئەسڵەن خۆی وابیربکاتەوە، بەڵام بەهەرشێوەیەك بێت دێژا ڤو لێکدانەوەیەکی جێگیری نیە. بە بۆچونی من ئەو جۆره باسە سایکۆلۆژیانە زیاد لە گرنگی و قەبارەی خۆیان گەورە کراون، بە شێوەیەك دەکرێ ئەوەندە سادە بێت ئێمە هۆکارەکەی قبوڵ نەکەین، بۆیە دوای چەندین لێکۆڵینەوە ناتوانین بگەین بە ئەنجامێکی جێگیر، یاخود دەگەین بە ئەنجامێك کە بە شتێکی گوماناوی تر ببەستینەوە وەك بەرجەستەبوونەوە، کە تا ئێستا نە پێناسەیەکی زانستی، نە بەڵگەیەك هەیە ڕاستی و بوونی ئەوە بسەلمێنێت. زۆرێك دەڵێن کاتێك دەبینین

منداڵێکی ٤ساڵان کەمان دەژەنێت، ئەوە هۆکارەکەی ئەوەیە کە لە ژیانی ڕابردوویدا (پێش بەرجەستەبوونەوەی)، کەسێکی کەمانژەن بووە، بۆیە ئەم سیفەت و توانایەی لەم ژیانەدا بۆماوەتەوە. هەروەها زۆرێك لە بودییەکان پێیان وایە تا چەند مرۆڤ بەرجەستەبێتەوە لە کات و زەمەنی جیا جیادا، ئەوە ئەزموون و هەڵە و کارە باشەکان زیاتر دەزانێت و فێردەبێت، تا وای لێدێت ئیتر پێویستی بە بەرجەستەبوونەوە نابێت، لە کۆتایدا دەبێت بە ڕۆحێك.

هەرچۆنێك بێت ، دێژا ڤو و بەرجەستەبوون دووانێکن، زانینی پەیوەندی نێوانیان گرنگە، دەشکرێ لە داهاتوودا ببن بە سەرچاوەی چەندین بابەتی سایکۆلۆژی و زانستی تر کە هێشتا مرۆڤ نەگەیشتووە پێی و نەیدۆزیوەتەوە .

## خاڵی چوارەم:

## " سەرهەڵدانی هاورەگەزبازی لە نێوان دوو تیۆردا "

یەکێك لەو بابەتانەی زۆر بە زەقی هەستی پێدەکرا لە ( Cloud Atlas) بریتیبوو لە هاورەگەزبازی، کاتێك لە ساڵی ١٩٣٦ مۆسیقا ژەنێك بە ناوی (رۆبێرت فرۆبیشەر) پەیوەندییەکی سۆزداری تەواوی هەیە بەرامبەر بە کەسێکیتر بە ناوی (روفوس سیکسمیس)، جگە لە کاری سێکسی، پەیام و نامەگۆرینەوەی زۆریان لە نێوان هەیە، تەنانەت تا دەگاتە ئەوەی رۆبێرت لە کۆتاییەکەیدا لە دووری سیکسمیس خۆی بکوژێت، هەرچۆنێك بێت ئەو چیرۆکە پێمان دەڵێت کە هاورەگەزبازیەکی تەواو لە نێوان ئەو دوو کەسەدا هەبوو کە نە سەرچاوە و نە هۆکارەکەی دیار نییە.

هاورەگەزبازی (Homosexuality) ئەو وشەیەی سەرەتا لە ساڵی ١٨٨٦ لە کتێبی (Psychopathia Sexualis ) (نەخۆشی دەروونی سێکسی) کە لە لایەن (ریچارد فرایتبینگ) نووسراوە، بەکارهاتووە. تێیدا هاورەگەزبازی وەك نەخۆشییەك و لادانی سێکسی باسکردووە کە توشی مرۆڤ دێت.[١٠] هەرچۆنێك بێت سەرەتای باسکردنی هاورەگەزبازی وەك نەخۆشییەك بووە لە کاتێکدا لە جیهانی ئەمرۆدا ئەو

بۆچوونەی کە زاڵە لەگەڵ ئەوەیە کە هاورەگەزبازی سروشتێکە هەندێك مرۆڤ لە کاتی لە دایك بونیانەوە لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن.

ئەگەرچی زۆربەی لێکۆڵینەوە پزیشکیەکان و دەرونیەکان دژ بەیەکن لەم بابەتە، کاتێك کە زانا بایلۆجیەکان پێیان وایە، هەندێك لە مرۆڤەکان لە کاتی لە دایك بونیانەوە هەڵگری سروشتی هاورەگەزبازین و (DNA)یەکەیان بە جۆرێکە جیاوازترە لە کەسانی ئاسایی، لە هەمان کاتدا زانا سایکۆلۆژیەکان(دەرونیەکان) دەڵێن کەوا کۆمەڵگا و دەوروبەر بە رێژەیەکی بەرز هۆکاری درووستبونی مرۆڤی هاورەگەزبازن، بەڵگەشیان بۆ ئەوە، لێکۆڵینەوەیەك بوو، کاتێك دوو پیاوی ئاسایی و دوو پیاوی هاورەگەزبازیان هێنا و دیراسەی پرۆسەی سێکسکردنی هەردوو لایان کرد(هاورەگەزبازەکان و ئاساییەکان)، بینیان جیاوازیەکی وانیە لە نێوانیاندا، بەو واتایەی پیاوێکی ئاسایی دەتوانێت وەك هاورەگەزبازێك هەڵسوکەوت بکات و هاورەگەزبازیشیان بە لادانی سێکسی دانا.

بەڵام تا ئێستا ئەوانەی خاوەنی تیۆرە بایلۆجیەکەن لە پێشەوەن، ئەوان بەڵگەی ئەوەیان هێناوەتەوە کە جگە لە مرۆڤ، هاورەگەزبازی لە نێوان ئاژەڵانیش بوونی هەیە. زانای کەنەدی (بروس باجەمیل) لە کتێبەکەی بە ناوی (بایۆلۆجی پڕچالاك: هاورەگەزبازی ئاژەڵان و جۆراوجۆری

سروشتی)کە ساڵی ١٩٩٩ چاپکراوە، تێیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر ٣٠٠ ڕەگەزی جۆراوجۆری ئاژەڵان کردووە و لە ئەنجامدا دەڵێت کەوا هاوڕەگەزبازی و لادانی سێکسی لای زۆرینەی پۆلەکانی ئاژەڵان شتێکی باوە.[11] بۆیە ئەگەر هاورەگەزبازی شتێك بێت کۆمەڵگا دروستکەری بێت بۆچی ئاژەڵان هەیانە. دەروونناسەکان لە پێناسەی هاورەگەزبازیدا دەڵێن لایەنی سێکسی زیادکراوی سێیەم. بەو مانایەی نێر لایەنی سێکسی بۆ مێ هەیە، مێیەش بۆ نێرە، بەڵام هاورەگەزبازی شتێکە و لە سروشت زیادکراوە، ئەوەش تا ڕادەیەکی زۆر بەڵگەیەکی بەهێزە، بەڵام زانا بایلۆجیەکان دووبارە بە نموونەی ئاژەڵ وەڵامی ئەو بەڵگەیە دەدەنەوە، دەڵێن : ئەگەر مرۆڤ توانای گۆڕانی کلتور و دەوروبەری هەبێت و بەو هۆیەوە لایەنێکی سێکسی تر زیادبکات، ئەوە خۆ ئاژەڵ خاوەن عەقڵ نیە و توانای ئەوەی نیە لایەن و ویستێکی سێکسی تر درووستبکات، ئەی هاورەگەزبازی چۆن لەناو ئەواندا سەری هەڵدا! دەشڵێن کەوا ئاژەڵ سێکس تەنها بۆ زۆربوون بەکارناهێنێت، بەڵکو بۆ درووستکردنی پەیوەندی و داواکردنی خواردن و بەتاڵکردن و جوڵاندنی هۆرمۆنات بەکاردەهێنن.

لەم نێوەندەدا پێم باشە بچینە لای دیمانەیەکی دکتۆر (سایمۆن لێڤای)، ئەو کەسەی بە ئاشکرا ڕایگەیاندووە کە هاورەگەزبازە، لە وەڵامی

پرسیاری ئەوەی کە ئایا ئەگەر هاورەگەزبازی لە سروشتی مرۆڤدا هەیە، ئەی هاورەگەزبازەکان چۆن زۆر دەبن، ئەو دەڵێت کەوا ئەو کەسانەی خزم و کەسی هاورەگەزبازیان هەیە، بە تایبەت ئافرەتان، ئەوە ئەگەری ئەوەیان هەیە جۆرێك لە (DNA)ی هاورەگەزبازیان تێدابێت و لێکۆڵینەوەکانیش دەریانخستووە کە ئەو جۆرە ئافرەتانە زۆرتر مەیلیان بۆ پیاو دەچێت و بە بەراورد لەگەڵ ئافرەتانی تر زووتر سکپڕ دەبن، زۆرینەی منداڵەکانیشیان ئەگەری هەیە هاورەگەزباز دەربچن.[١٢]

دوور لە زانست و لێکۆڵینەوەکان، ئەگەر بێینە سەر باسی دینەکان، ئەوە گشتیان هاورەگەزبازی رەتدەکەنەوە و بە تاوان لە قەڵەمی دەدەن، وەك ئەوەی لادان بێت لە سروشتی مرۆڤ، بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بەو تیۆرە هەیە کەوا هاورەگەزبازی سروشتی مرۆڤ بێت دەڵێن کەوا ئەو قەدەغەکردنەی دینەکان لەبەر بڵاونەبوونەوەی نەخۆشی بووە، وەك چۆن خواردنی گۆشتی بەراز و سێکسی پێش هاوسەرگیری و چەند شتانێکی تریان قەدەغەکردووە.

هەرچۆنێك بێت، لێرەدا دەگەینە ئەو بڕوایەی کە دایڤد (نووسەری (Cloud Atlas) ) یەکێکە لەوانەی بڕوای وایە هاورەگەزبازی لە سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت بە پێی چیرۆکی فیلمەکە، چونکە

ئەگەر لە ئێستادا هاورەگەزبازی زۆر فراوان بێت و بە شێوەیەك یاسای هاوسەرگیری بۆ دابنرێت لە ولآتان، ئەمریکا بۆ نموونە. ئەوە لە فیلمەکەدا لە سالآنێکی کۆن بوونی هاورەگەزبازی باس دەکات، بۆ ئەوەی پێمان بلێت کە ئەوە شتێکی سروشتیە و شتێك نیە بە تێپەربوونی کات دروستکرابێت.

حەزدەکەم لە پاڵ ئەو فیلمەوە بۆچوونی خۆم لەسەر ئەو بابەتە بلێم، پێموایە کۆمەڵگا و لایەنی جەستەیی مرۆڤ دروستکەری هاورەگەزبازیە، دەربارەی ئەوەی هاورەگەزبازی نابێت دروستکراوی لایەنی سێکسی سێیەم بێت و ئەگەر وایە بۆچی ئاژەلآنیش هاورەگەزبازن، دەمەوێ بلێم کەوا ڕاستە ئاژەڵ توانای بیرکردنەوەی نیە، بەلآم کەس پرسیاری ئەوەی نەکرد کە ئایا ئەگەر تەنانەت بێتو هاورەگەزبازی دروستکراوی لایەنی سێکسی سێیەمی بێت ئایا لە ڕێگای بیرکردنەوە و عەقڵەوە دروستبووە یاخود حەز و شەهوەتی جەستەیی؟ هەموومان دەزانین عەقڵ بە گشت پێوەرەکان دوورە لە پرۆسەی سێکس، لە وتارێکی نووسەر و لێکۆڵەر (مەحمود شێرزاد) لە ژێر ناوی (سێکسی سروشتی) باسی ئەسڵ و سروشتی سێکس دەکات و دەڵێت: "وەك ڕووناك سرشتەکان ئەزموونیان کردووە، ئەو چێژە بێ هاوتایەی لە سێکسدایە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە کەسەکە لە کات و شوێندا نامێنێ، دەچێتە دەرەوەی کات و شوێنەوە، چێژی سێکس

تەنیا لەوەوە سەرچاوە دەگرێ و دووبارە کردنەوەکەشی هەر بۆ ئەزموون کردنەوەی ئەو مقامەیە. خۆناسەکان بۆ هەمیشە لە چوارچێوەی کات و شوێن دەچنە دەرەوە، ئەو کەسانە لە بواری سێکسییەوە سروشتیی دەبنەوە، تەنیا لە کاتی سروشتی خۆیدا سێکسی سروشتی دەکەن، نەك وەك مرۆڤەکانی تر دوازدە مانگی ساڵ شەو و ڕۆژ بوونەوەرێکی سێکسی بن و لە کۆنترۆڵی سێکسێکی سەتحیدا بن." ئەمە چەند ڕستەیەکی نێو وتارەکەی مامۆستا (مەحمود شێرزاد)ە، ئەوەی دەتوانین پێی بگەین لێرەدا، بریتییە لەوەی کە پرۆسەی سێکسکردن، پرۆسەیەکە عەقڵ بە شێوەیەکی زۆر کەم تێیدا بەشدارە، حەز و شەهوەت لە پێش هەموویانەوەیە، هەروەها ئەم پرۆسەیە دەرچوونی مرۆڤە لە کات و شوێن، بەشێوەیەك زۆرینەی ئەو مرۆڤانەی ئالودەی سێکسن بۆ گەیشتن بەو مەقامە سێکس دەکەن، بۆ گەیشتن بە چێژێکی زۆری جەستەیی و دەرچوونێکی کاتی لەم زەمەن و شوێنەی تێیدا دەژین.[١٣]

یاخود، عەلی وەردی لە سەرەتای کتێبەکەی بە ناوی (گاڵتەجاری عەقڵی مرۆڤ– مهزلە العقل البشری)، باس لەو کەشتیوانانە دەکات کە بەهۆی گەشتی دوور و درێژەوە و دووربون لە ڕەگەزی بەرامبەر، بە ناچاری تووشی لادانی سێکسی بوون و هاوڕەگەزباز دەرچوون.[١٤] یان ئەوەتا

سەربازەکان بەهۆی مانەوەی زۆریان لە جەنگدا تووشی هەمان حاڵەت دەبن.

(سایمۆن لیڤای)، ئەسڵەن خۆی لە پرسیارەکە دزیوەتەوە، ئەگەر هاورەگەزبازی جۆرێك بێت لە سروشتی مرۆڤ، دەبووایە تا ئێستا بوونی نەمابایە، چونکە بێگومان هاورەگەزبازەکان توانای زۆربونیان نیە، بەڵام وەك گوتم کۆمەڵگا( دەوروبەر) و حەزی جەستەیی هۆکاری درووستبونیەتی، بۆیە تا ئێستا هەر ماوە، تەنانەت لە چاو ساڵانی پێشوتر ڕووەو زیادبوونە، بە شێوەیەك لە چەند وڵاتێك بە یاساکراوە و لە چەند وڵاتێکی تریش کاری زیاتری بۆ دەکرێت.

دەربارەی بۆچونی دین لەسەر هاورەگەزبازی، هەمیشە پێم وابووە دین ڕێکخەری ژیان و پارێزەری ڕەوشتی مرۆڤایەتی بووە بە شێوەیەکی گشتی. سێکس و دوو ڕەگەزیش کە نێر و مێیە بۆ پاراستنی توخمی مرۆڤ و تەواوی بوونەوەرانی ترە، ناشکرێ دین ڕێگا بە ئاسایی بوونی هاوڕەگەزبازی بدات، بە جۆرێکیتر بە ئاسایی بزانرێت، چونکە گەر وانەبوایە: بهێنە پێش چاوی خۆت دین فەرمانی ئاساییکردنی دابوایە. جیهانێك لە تێکچوونی ڕێرەوی مرۆڤایەتی درووستدەبوو .

## خاڵی پێنجەم:

## "کۆیلایەتی: ویستێکی نەبڕاوەی مرۆڤ"

کۆیلایەتی یاخود بە کۆیلە کردن، بریتییە لە مامەڵەکردن بە خەڵکی و کارپێکردنیان بەزۆر و دوورخستنەوەیان لە ویست و ئارەزوو و مافی مرۆڤبوونی خۆیان. کەسێك کارێکی پێ بسپێردرێت نەتوانێت بڵێت نایکەم، کەسێك نەتوانێت خۆی هەڵبژێرێت چی بوێت یان بە دڵی خۆی هەڵسوکەوت بکات، کەسێك بکڕدرێت و بفرۆشێت، تەنانەت کەسێك نەتوانێت ئازاد بێت لە هەبوونی بۆچوون و بیرکردنەوەی خۆی، ئەوانە گشتی کۆیلەبوونی مرۆڤە.

کۆیلایەتی، بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بوونی هەبووە لە قالب و شێوەی جیا جیادا، وەك ئەوەی لە سەرەوە شێوەکانیمان نووسیوە، بەلأم دەبێ بپرسین، درووستکەری کۆیلایەتی چییە؟ (ماکسیم گۆرکی) نووسەری روسی دەڵێت: کاتێك کارکردن لە ئارەزوو و خۆشیەوەیە، ژیان خۆشیەکی گەورەیە، بەلأم کاتێك کارکردن ئەرکێکە، ژیان کۆیلایەتیە. لێرەدا ماکسیم وەك زۆربەی هۆکارەکانی کۆیلەبوون بیرۆکەکەی دەخاتەڕوو، پێی وایە ئەرك (بەزۆر کارپێکردن) کۆیلایەتیە، لە بەرامبەر ئەوەشدا دەڵێت ئەو کارەی بە

خۆشی خۆت دەیکەیت، ژیانێکی خۆشیت پێدەبەخشێت، بەلآم ئایا ناکرێت تەنانەت مرۆڤەکانیش ویست و حەزی کۆیلەبوونیان هەبێت؟

ئەو بنەمایانەی یاخود ئەو هۆکارانەی کۆیلەبوون درووستدەکەن لەسەر زۆربەی جۆرەکانی کۆیلایەتی دەچەسپێن، وەك ئەوەی جۆرەکان دەستنیشان کراون بەم شێوەیەی خوارە کە سەرچاوەکەیم لە ویکیپێدیا هێناومە لە ژێر ناوی (Slavery) "کۆیلایەتی":

کۆیلایەتی خاوەندارێتی: ئەو جۆرە مرۆڤانە دەگرێتەوە کە وەك موڵکێکی تایبەتی مامەڵەیان لەگەڵ کراوە و کڕین و فرۆشتنیان پێکراوە، یان زۆربەیان بە مەبەستی خزمەتکردن و کاری سێکسی ئاڵوگۆڕیان پێکراوە.

کۆیلایەتی قەرز : ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بەهۆی نەدانەوەی قەرزێك ناچارن خۆیان یاخود منداڵەکانیان بدەن وەك کۆیلە بەو کەسەی قەرزەکەی لێوەرگیراوە.

کۆیلایەتی بەزۆر: ئەوانەی بەزۆر کاریان پێدەکرێت بەهۆی سزایەکەوە یاخود هەرەشەیەك کە ناچارە ببێت بە کۆیلە.

کۆیلایەتی هاوسەرگیری (هاوسەرگیری بەزۆر): ئەو جۆرە کۆیلایەتیە تا چەند دەیەیەك لەم وڵاتەی ئێمەش بوونی هەبوو، کاتێك

مرۆڤێك زۆری لێدەكرێت بۆ ئەوەی شو بە كەسێك بكات كە بە ویست و ئارەزووی ئەو نیە.[15]

ئەوانە گشتی چەند جۆرێكی كۆیلەبوونی مرۆڤن لە سەردەمی كۆندا، كە دەكرێت هێشتا هەندێك جۆریان لە هەندێك شوێنی جیهانی سێیەم بوونی مابێت، ئەو شوێنانەی رۆشنایی زانست و زانینی پێنەگەیشتووە و مافەكانی مرۆڤی تێدا نەبیستراوە، بەڵام لەگەڵ گەیشتنی شارستانیەت ئەو جۆرە كۆیلایەتیانە بەرەو نەمان دەچن.

تاكە پرسیارێك پێویستە لێرە بیكەین ئەوەیە، ئایا كۆیلایەتی لە ناو شارستانیەت بوونی هەیە؟ دایڤد (نووسەری (Cloud Atlas) ) وەڵاممان دەداتەوە و دەڵێت بەڵێ، نەوەك تەنها بوونی هەیە، بەڵكو تا شارستانیەت بەرەوپێشبچێت كۆیلایەتی بە شێوەی جیا جیا درووستدەبێت و سەرهەڵدەدات.

دایڤد، ئەو جۆرە كۆیلایەتیانەمان لە رۆمانەكەیدا( Cloud Atlas ) بۆ باسدەكات و لە كاتی رابردوو، سەردەمی یەكەم ساڵی (١٨٤٩) باس لە پارێزەرێكی گەنج دەكات بە ناوی (ئادەم وینگ) كە بەهۆی گەشتێكیەوە لەناو كەشتیەك بە رەشپێستێك شاد دەبێت كە دزەی كردۆتە ناو كەشتیەكەوە و داوای یارمەتی لێدەكات بۆ ئەوەی رێگا نەدات كاپتنی

کەشتیەکە بیکوژێت (بێگومان لەبەر ئەوەی رەشپێستە و لەبەر ئەوەی دزەی کردۆتە ناو کەشتیەکە) پارێزەرەکە یارمەتی دەدات و دواتر دەبێتە هاورێیەکی نزیکی رەشپێستەکە (بە شێوەیەك پارێزەرەکە گرنگی بەوە نادات ئەو پارێزەرە و ئەو رەشپێستەش کۆیلە). لێرەدا دایڤد، هەم کۆیلەبوونی مرۆڤ نیشان دەدات لەبەر جۆری رەگەزی کە یەکێکە لە هۆکارەکانی کۆیلایەتی لە کۆندا و لە ئێستادا بوونی نیە، هەم سەرەتایەکیش بۆ رواندنەوەی ئەو جیاوازیە بەهۆی جیاوازی رەگەز و رەنگەوە لەو کاتەدا.

ئەوەی گرنگە لێرەدا، دایڤد جۆرێکیتر لە کۆیلایەتی باس دەکات کە تەنانەت لە قۆناغێکی گەورەی شارستانیەت بوونی هەیە. لە کاتی داهاتوو، سەردەمی پێنجەم سالّی (٢١٤٤)، دایڤد نموونەی کارگەیەکی گەورە نیشان دەدات کە دەست بەسەر بیر و مێشکی مرۆڤدا دەگرێت و بەکاریدەهێنێت بۆ ئارەزووی تایبەتی خۆی کە ئەویش خزمەتکردنە بە شوێن و کالاّکانی، رێستورانتێك بۆ نموونە، بەکارهێنانی مرۆڤ بۆ کارکردن و خزمەتکردن لە رێگای دەستگرتن بە مێشك و هەست و سۆز و بیرکردنەوەی هۆکاری کۆیلە کردنی مرۆڤە لە داهاتوودا. مرۆڤ چونکە بونەوەرێکی فێرنەکراوە، ناچارە سوود لە هۆکارەکانی بیرکردنەوە وەربگرێت تاوەکو فێربێت، بەلاّم ئەوەی

ئەو کارگەیە دەیکات بریتییە لە نەهێشتن و لابردنی گشت ئەو هۆکارانەی وا لە مرۆڤ دەکەن بیربکاتەوە، بۆیە ئەوان هەر لەگەڵ لە دایك بوونی ئەو مرۆڤە هیچ هۆکارێك ناهێڵنەوە تا وابکات ئەو مرۆڤە بیربکاتەوە و تێبگات کە ژیان تەنها خزمەتکردن و کارکردن نیە، ئامانجی ئەوەش بریتی دەبێت لە دەستەبەرکردنی کۆمەڵێك مرۆڤی کۆیلە کە ئازاد نین لە هیچ شتێك، چونکە تەنانەت بیرکردنەوە لە ئازادیان پێ شتێکی نامۆیە و دوورن لێی.

بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ئەوەی کە مرۆڤ بونەوەرێکی فێرنەکراوە، لە فیلمی ( Man Of Steel) هەسارەیەك هەیە بە ناوی (کریپتۆن)، لەوێوە منداڵەکان هەڵدەگیرێن بۆ ئەوەی گەورەکان هەڵبژێرن لە داهاتوودا هەریەکەو ببێت بە شتێك، ئەوەش لە شێوەی پرۆگرامێکی کۆمپیوتەری ڕێکخراوە کە هەر منالێك دوای لە دایك بوون داهاتووی دیاریبکرێت بێ ئەوەی خۆی ویست و بیرکردنەوەی تێیدا بەشداربێت، لەم نێوەندەدا دایك و باوکێك پەیا دەبن کە بەنهێنی منداڵێکیان بە سروشتی دەبێت و دەینێرن بۆ هەسارەیەکیتر، تاوەکو ئەو منداڵە جیاوازتر دەربچێت و خۆی بڕیار لەسەر داهاتووی خۆی بدات، تاوەکو ببێت بە شتێك لەو شتانە گەورەتر کە دەسەلاتدارانی هەسارەکە بۆ منداڵەکانیان هەڵبژاردبوو، هۆکارەکانی بیرکردنەوە کاریگەرن لەسەر داهاتووی هەر کەسێك لە کۆمەڵگادا، ئەگەر تۆ

هۆکارەکانت گشتی کرد بە شتانێك کە تاکێك بەرەو ئەوە ببەن بیکەن بە خزمەتکارێك، ئەوە خزمەتکارێکی لێ دەردەچێت، ئەگەر هەموویانت کرد بە سەرکردەیەك، ئەوە سەرکردەیەکی لێ دەردەچێت.

ئەو دووجۆرە کۆیلایەتیەی (دایڤد میشێل) باسی کردووە، یەکێکیان لە ڕابردوویەکی دوور و ئەویتریان لە داهاتوویەکی دوور شتێانێکی زۆر گرنگن و باسنەکراون. دەمەوێ لێرەدا وەلآمی پرسیارێك بدەمەوە کە لەسەرەتا کردبووم و بڵێم بەڵێ کۆیلایەتی بە ئارەزوی مرۆڤەکانیش هەیە لە نێو شارستانیەتدا، بۆ نموونە لەم کاتەی ئێستادا.

مرۆڤەکان لەم سەردەمەدا لە زۆر ڕووەوە بوون بە کۆیلە و هەستی پێناکەن، کۆیلەن بەهۆی کارەوە، کۆیلەن بەهۆی ئایدیۆلۆژیاوە. دەمەوێ لێرەدا بە ماکسیم بڵێم، گەر ئەم سەردەمەی ئێستات دەبینی، دەتزانی کە کارێك ئەگەر خۆشی و ویستیشی تێدابوو زۆر جار هەر کۆیلایەتیە. لە شارستانیەتی ئەمڕۆدا کارکردن بۆتە کۆیلەبوون، کۆیلەبوونێکی شاراوە یاخود هەستپێنەکراو. تۆ لە کۆمپانیایەك دادەمەزرێی، ناتوانی یاساکانی کۆمپانیاکە بشکێنی، ناتوانی کە فەرمانێکت پێدرا جێبەجێی نەکەی، ناتوانی هەرشتێك پێت خۆشبێت بیکەی، لە کۆتایشدا دڵخۆشی بە کارەکەت، چونکە بۆت گرنگ نیە ئەو کۆمپانیایەی کاری لێدەکەی، کار

بۆچی دەکات ! ،ڕەخنەگرتن و دەستێوەردان لە ئامانجی کۆمپانیاکەت ڕەنگە ببێتە هۆکاری لە کار لادانت، بەڵام تۆ هەرگیز ئەوە ناکەی، چونکە ناتەوێت بژێوی ژیانت و هەموو ئەو ساڵانەی خوێندنت بەهۆی بیرکردنەوە لە ئامانجی کۆمپانیاکەت لە دەست بدەی، بۆیە دەستکەوتنی کار لە وڵاتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی یەکێکە لە خاڵە هەرە گرنگەکانی ژیانی هاوڵاتیان، هەمان شتیش لەسەر دەزگایەکی حکومی جێبەجێ دەبێت وەك چۆن لەسەر کۆمپانیایەك جێبەجێ دەبێت.

ئەم جۆرە کۆیلە بوونە دەچێتە ژێر باری (کۆیلەی کرێ یاخود پاداشت)، بە ئینگلیزیەکەی (wage slave)، ئەم چەمکە لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدە بەکارهات، کاتێك خەڵکێکی زۆر ناچار بە کارکردن بوون لەپێناو وەرگرتنی بڕە پارەیەکی کەم تەنها ژیانی خۆیان پێوە بەڕێوەبچێت، یەم جۆرەش مرۆ ناچار دەبێت بە کارکردن لەپێناو ژیانی. لە ساڵی ١٧٦٣، ڕۆژ نامەنووسی فەرەنسی (سایمۆن لینگوێت) لە پێناسەی (کۆیلەی کرێ) دەنووسێت: کۆیلەکە زۆر دڵسۆز و گوێڕایەڵ بوو بۆ بەرپرسەکەی تەنها لەبەر ئەوەی پارەی پێدەدا.[١٦] لەم سەردەمەی ئێستاشدا، بەجۆرێك لە چەند کۆمەڵگایەکدا هەمان شت دەبینین، بە تایبەت لەو وڵاتانەی هەلی کار تێیدا زۆر کەمە و بەشێکی زۆری دانیشتوانی ناچارن

به کارکردن لەپێناو ژیانیان، کار بە جۆرێك لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگادا دابەشبووە کە ئەستەمە بێ کارکردن بژی. بە پێی چەند راپۆرتێکی رۆژنامەی (نیو یۆرك تایمز)ی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠١٢دا، هەندێك کارگەی درووستکردنی یاری منداڵان و کەل و پەل لە چین، نزیکەی ٢٣٠ هەزار کرێکاریان هەیە، هەر کرێکارێکیش شەش رۆژ لە هەفتەیەکدا کار دەکات و رۆژانەش ١٢ سەعات بەسەردەبات لەوێ، تەنها کرێی رۆژێکیش ١٧ دۆلارە، تەنانەت کەمتریش.[١٧] ئێستا بێنە پێش چاوت، دەبێت ئەو کرێکارانە چ ژیانێکیان هەبێت؟

کۆیلەبوون لە رێگای ئایدیۆلۆژیاوە یەکێکیترە لە جۆرەکانی کۆیلە بوون لەم سەردەمەدا. لەم هەرێمە بچووکەی خۆماندا، ڕوانینی هاوڵاتی بۆ ئایدیۆلۆژیا ئەوەندە لاوازە کە دەتوانم بڵێم رێژەیەکی زۆر لە خەڵکی ئێمە، کۆیلەی چەند حیزبێکی دیاریکراوە، کۆیلەی ئایدیۆلۆژیەکەی ئەوانە، کۆیلەی فەرمانەکانیان، کۆیلەی دەسەڵاتەکەی ئەوان، بۆیەش بوێری ئەوەیان نیە رۆژێك بپرسن و بڵێن سەرۆکی حیزبەکەم یان هەرێمەکەم بۆچی وایکرد یان نەدەبوایە وابکات، چونکە کۆیلەی ئایدیۆلۆژیای سەرۆکن. جۆرێکیتر لە کۆیلە بوون، زۆر جار بریتییە لە سەرسامبوون بە ڕادەیەکی زۆر بە کەسایەتیەك، زۆر جار لە هەواڵەکان دەبینین یان گوێمان لێدەبێت

که کەسێك بۆ فلان گۆرانیبێژ وای لەخۆی کردووە یاخود شێوەی ئەوی لەسەر جەستەی کوتاوە، تەنانەت سالأنێك بەر لە ئێستا هەوالّی ئەوە هەبوو کە کەسانێك لە ولأتی ئەرژەنتین، ئەستێرەی تۆپی پێ (مارادۆنا) دەپەرستن، وەك گەورەییەك بۆ ئەو مرۆڤە.[18] سەرسامبوون بە ڕادەیەکی زۆر بریتییە لە کۆیلە بوون بە هەموو پێوەرەکان، ئەم جۆرە کۆیلە بوونە لە ئێستادا لە ولأتە ڕۆژئاواییەکان ڕێژەکەی زۆرە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆری ئەو ئەستێرەی سینەمایی و یاریزان و کەسایەتییە ناودارانەی لەوێدا هەن.

## خاڵی شەشەم:

## "گۆڕان و کورتبوونەوەی زمان لەگەڵ تێپەڕبوونی کات"

زمان سەرەکیترین هۆکاری تێگەیشتن و پەیوەندیکردنی نێوان مرۆڤەکانە، بۆیە باسکردن لێیەوە بابەتێکی زۆر فراوانە و لە زۆر لایەنەوە گرنگیەکی زۆری هەیە، بە تایبەت لە ڕوانگەی فەلسەفی یاخود فیکرییەوە. (سامویێل جۆنسن) نووسەری ئینگلیز و خاوەنی فەرهەنگی ئینگلیزی لە ساڵی ١٧٥٥ دەربارەی زمان دەڵێت: زمان جلوبەرگی بیرکردنەوەیە.[١٩] بەو واتایەی زمان ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەیە، بەڵام بەرامبەر ئەوە ڕەنگدانەوەیەکی گەورەی هەستیشە.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئایا کورتبوونەوەی ڕستەکانی زمان واتای کەمبوونەوەی هەست و بیرکردنەوە دەدات یاخود هەر مەبەست لە کورتبوونەوەی زمان چییە؟

دایڤد لە (Cloud Atlas) یەکێك لە خاڵە گرنگەکان کە لە داهاتووی مرۆڤایەتیدا ئاماژەی پێداوە بریتییە لە کورتبوونەوەی ڕستەکانی زمان و گۆڕانی زۆرێك لە ڕەسەنیەتی وشەکانی زمانی ئینگلیزی و بە پێشەنگ مانەوەی لە ئاستی نێودەوڵەتیدا. پێش جەنگە جیهانییەکان یاخود

باشتر بڵێین سەدەیەك بەر لە ئێستا زمانی فەرەنسی و لاتینی بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردەهاتن کە وەك زمانێکی نێودەوڵەتی وابوو، بەڵام دوای جەنگی جیهانی دووەم زمانی ئینگلیزی بە شێوەیەکی بەرفراوان گەشەی کرد، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێك کە گرنگترینیان ئەو هێزە ئابوریی و سەربازیەی ئەمریکا بوو، کە کاریگەر بوو بۆ بەرەوپێشچوونی زمانی ئینگلیزی. بۆیە لە ئێستاشدا زانینی زمانی ئینگلیزی مەرجێکی گەورەی بەدەستهێنانی کار و کاری بازرگانی و تەنانەت خوێندنیشە، بەهۆی ئەو پێگە گەورەیەی هەیەتی، ئەگەری هەیە لە داهاتوودا بە زۆر لایەنی تر ببەسترێتەوە، بۆ نموونە نەزانینی زمانی ئینگلیزی پەیداکردنی بژێوی ژیان قورستر بکات.

لە کاتی (داهاتوو) سەردەمی پێنجەم ساڵی (٢١٤٤)، تێکەڵەیەکی زۆر لە نێوان رەگەزە جیاجیاکانی مرۆڤایەتی دەبینین کە هەمووشیان بە زمانی ئینگلیزی دەدوێن، بۆ نموونە ئەو مرۆڤانەی لەو کاتەدا لە فیلمەکەدا پیشان دەدات زۆرینەیان ئاسیایین، ئەوەش پێمان دەڵێت کە رەگەزە جیاوازەکان لە داهاتوودا بەهۆی زمانەوە بە ڕادەیەکی زۆر لەیەکتری نزیك دەبنەوە، تەنانەت ئێستای ئەمریکا، ئەو وڵاتەی ئەمریکیەکان ناویان لێناوە وڵاتی پەنابەران بەهۆی زۆری رێژەی پەنابەران تێیدا. دایڤد دەیەوێت بڵێت

ئەگەر بێتوو لە داهاتوودا نزیکبوونەوەیەکی زۆر لە نێوان نەتەوەکانی جیهان ڕوویدا، ئەوە بەهۆی زمانێکی یەکگرتووەوەیە، کە زمانی ئینگلیزی دەبێت. بەرهەمە بازرگانیەکان بە زمانی ئینگلیزی لەسەریان نوسراوە، میدیاکان وشەی ئینگلیزی و ناوی ئینگلیزی بەکاردەهێنن، جیهانی ئینتەرنێت و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان هەر بە ئینگلیزین، شوێنە گەشتیاری و مارکێتەکانمان ناوی ئینگلیزیان هەیە، نوێترین کاریگەریش لەم دواییەدا بریتییە لە خزاندنی وشەی ئینگلیزی لە فەرهەنگی کوردیدا لە لایەن ڕۆشنبیر و نووسەرەکانمانەوە، کە گشت ئەوانە کاریگەری هەبوو لە تاکی کۆمەڵگا، ئەوا زمانی ئینگلیزیش بە زیندوویی دەمێنێتەوە، ئەوەی لەسەر ئەم وڵاتەی خۆمان جێبەجێ دەبێت لە کاریگەری ئەوانە لەسەر تاکی کۆمەڵگا، بۆ هەموو وڵاتانی تریش جێبەجێ دەبێت، هەر ئەوەشە وای لە دایڤد کردووە ئەوەندە دڵنیابێت لە "نێودەوڵەتی" مانەوەی زمانی ئینگلیزی دوای سەدە و نیوێك پاش ئێستا.

بەڵام جگە لەوە، خاڵێکی زۆر گرنگتر دایڤد ئاماژەی پێداوە، ئەویش گۆڕانی زمانی ئینگلیزیە لە داهاتوودا بەهۆی کورتبوونەوەی ڕستەکان و شێوازی دەربڕینیان. لە ساڵی (٢٣٢١) واتە سەردەمی شەشەم لە ڕۆمانەکەی دایڤد، ئەو زمانە ئینگلیزیەی دانیشتوانی ڕزگاربووی

سەرزەوی قسەی پێدەکەن زۆر جیاوازترە لەو ئینگلیزیەی لە ئێستادا هەیە، تەنانەت ئەو ئینگلیزیەی دوای سەدەیەکیش. ئەگەر بێتوو سەیربکەین زمانی ئینگلیزی هەمیشە لە گۆڕاندا بووە، ئەوەش ڕەنگە بەهۆی زۆری لەهجەوە بووە، تا ئەوکاتەی زمانێکی یەکگرتوویی ئینگلیزی نێودەوڵەتی دانرا، کە لە زۆر ماڵپەر و کتێب و وتارەکان بەکارهات و بەکاردێت. بەمەش گۆڕانی زیاتری زمانی ئینگلیزی وەستا و زۆر هێواش بوویەوە. ئایا هۆکاری چییە زمانی ئینگلیزی لە داهاتوودا بەرەو دەربڕینی کورت دەچێتەوە؟

ڕەنگە وەڵامەکە تەنها لای دایڤد و ڕۆمانەکەی بێت، لە ساڵی (٢١٤٤) کە دەکاتە سەدە و نیوێك پاش ئەمڕۆ، زمانی کاراکتەرەکان هیچ کورتیەکی پێوە دیار نیە، بەڵکو بگرە زۆر ئاساییە، ئەی کەواتە بۆچی دوای دوو سەدە (ساڵی ٢٣٢١) دەگۆڕێت؟ لەبەر ئەوەی ئەو هۆکارەی کە هەڵگری زمانێکی یەککگرتوویی ئینگلیزی بوو لە ساڵی (٢٣٢١)دا نەماوە. واتە: ئەو هۆکارە کە بریتییە لە تەکنەلۆژیا هەڵگری زمانێکی یەکگرتووی ئینگلیزی بوو، دوای هەڵگیرسانی جەنگ و وێران بوونی زەوی و گەڕانەوەی بۆ چاخە کۆنەکان، هیچ شتێك نامێنێت بە ناوی زمانی یەکگرتوو، ئەوەش بە ڕوونی دیارە لە ساڵی (٢٣٢١) کاتێك زەکەریا (کاراکتەری ڕۆمانی ( Cloud Atlas) ) قسە لەگەڵ خوشکەکەی و کچەکەی دەکات، بە زمانێکی ئینگلیزی کورتکراوەی ڕستەکان، قسە دەکات، ئینگلیزیەك کە نە بەریتانییە

نە ئوستڕالی نە ئەمریکیش. ئەو کورتبوونەوەی زمانە لە ئێستاشدا هەستی پێدەکرێت، لە ولاتە قسەکەرە ئینگلیزیەکان، ئەمریکا و بەریتانیا بە نموونە، خەڵکەکەیان لە ناوخۆدا بە زمانێك قسە دەکەن کە دەربڕینی وشەکانیان کورتە، وەك بڵێی زیاتر جەخت لە تێگەیشتنی یەکتر بکەنەوە نەوەك جۆری دەربڕین، بەلاّم ئەو کورتکردنەوەیە بەردەوام نابێت، یاخود باشتر بڵێین، گەشە ناکات لە ئێستادا. چونکە هۆکارێکی کاریگەری وەك تەکنەلۆژیا و بەهێزی ئابووری ولاّتان زمانە یەکگرتووەکە دەپارێزێت، (کە دەڵێین تەکنەلۆژیا مەبەستمان گشت جۆرەکانی میدیا ئەلیکترۆنیەکان بەرهەمە ئەلیکترۆنییەکانە).

بۆیە لە ئەنجامدا دەتوانین بڵێین کورتبوونەوەی دەربڕینی زمان لە هۆکاری گرنگینەدانە بە تەواو دەربڕینی وشەکان و ڕستەکان لە لایەن قسەکەرانەوە، بەلاّم تەکنەلۆژیا ڕێگا بە فراوانبوونی ئەو کورتبوونەوەیە نادات و تا ئەو کاتەی بوونی هەبێت دەیپارێزێت. ئەگەر بێتوو لە داهاتوودا هۆکارێك نەمایەوە بۆ بەکارهێنانی زمانی یەکگرتوو، ئەوا وەك لە فیلمەکە پیشان دراوە، زمانی ئینگلیزی بەرەو کورتبوونەوە و گۆڕانی زیاتر دەڕوات تا ئەو شوێنەی لەهجەیەکی نوێ سەرهەڵدەدات، لەهجەیەك کە لە غیابی هۆکارگەلێکی وەك پەروەردە و تەکنەلۆژیا دروستبووە. بۆ زیاتر تێگەیشتن لە بابەتەکە، دەتوانین نموونە بە زمانی کوردی بهێنینەوە لە سەردەمی پێش ڕاپەڕین و پاش ڕاپەڕین؛ دواى سەربەخۆبوونی دەسەلاّتی

کوردی(هەرێمی کوردستان) و دانانی مەنهەجی زمانی کوردی و ئەدەبی کوردی، ئەو نەوانەی دوای ڕاپەڕینەوە ڕوویان لە قوتابخانەکان کرد، ئێستا بە جۆرێ جیاوازتر لەوانەی پێشتر خۆیان دەخافتن و دەنووسن، تەنانەت منیش، ئەم شێوەی ئێستا دەینووسم، هۆکارێکی گەورەی دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی پەروەردە، هەر لە ئەلف و بێ کەی (ئیبراهیم باڵدار)ەوە بیگرە، تا کتێبە زانستییەکان.

ئەوەی لێرەدا گرنگە، تا سیستەمێکی یەکانگیر نەبێت بۆ چەسپاندنی زمانێکی یەکگرتوو لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا جا بە شێوەی پەروەردە بێت یاخود هەر هۆکارێکی کاریگەری تر، هیچ زمانێکی یەکگرتوو درووست نابێت، تا بەم شێوەیەش بەردەوامبێت، منێك لێرەوە بەم سۆرانییە دەینووسم، برادەرێکیش لە بادینانەوە، بە کرمانجی.

## خاڵی حەوتەم:

## "وتەکانی دایڤد میشێل لە ڕێگای (Cloud Atlas)ەوە"

هاوشان لەگەڵ گشت ئەو بیرۆکە و نوێگەری و ئەندێشە جوانانەی دایڤد لە ڕۆمانەکەیدا نەخشاندویەتی، تێیدا چەند وتەیەکی بەنرخی خۆی لە ڕێگای کاراکتەرەکانەوە گوتووە. دایڤد خاوەن بیرکردنەوەیەکی فراوان و تایبەت بەخۆیەتی، بە شێوەیەك بیرکردنەوەکانی لە وتەکانیدا چەسپاندووە، ئێمەش لێرەدا هەوڵدەدەین هەندێك لە وتەکانی کە لە ڕۆمانەکەی (Cloud Atlas) ئاماژەی پێداوە، خوێندنەوەیەکی بۆ بکەین.

**"ژیانمان هی خۆمان نیە، لە منداڵدانەوە تا گۆڕ، ئێمە بە ئەوانیتر بەستراوینەتەوە، ڕابردوو و ئێستا، بە هەر تاوانێك و میهرەبانیەك، داهاتوومان لە دایك دەبێتەوە"**

ئەو وتەیەی دایڤد لە (Cloud Atlas) بە زمانی (سۆنمی) دەکرێت، سۆنمی وەك پێشتر لە بەشەکانیتر باسمان کردووە یەکێك بوو لەو کەسانەی وەك کۆیلەیەك وابوو کاتێك لە ڕێستورانتێك کاری دەکرد، پاش ئەوەی بزووتنەوەی (یاخیبووانی یەکگرتوو) ڕزگاریکرد و پیشانیدا کە ئەو کێیە و ئامانجی ئەوان چییە، سۆنمی لە تۆمارێکی ڤیدیۆیی کە بۆ خەڵکانی

دوای خۆی تۆمارکردووه، یەکێك لە وتەکانی ئەو وتەیەی سەرەوە دەبێت، بەڵام ئایا سۆنمی مەبەستی چییە لەم وتەیەی یاخود باشتر بڵێین دایڤد دەیەوێت چیبڵێت لە ڕێگای سۆنمییەوە؟

ئەو گوتەیەی دایڤد، تەواو لەگەڵ بنەمای ڕۆمانەکەی یەکدەگرێتەوە، وەك لەسەرەتادا گوتمان، پێناسەی فیلمەکە بەو شێوەیە کراوە: (چالاکیەکانی تاکێك لە هەر سەردەمێکدا کاریگەر دەبێت بەسەر تاکی داهاتووی سەردەمێکی تر، بکوژێك لەو سەردەمە ڕەنگە دوای سەدەیەك ببێت بە پاڵەوانێك، یاخود بیرۆکەیەك دەتوانرێت بگۆڕدرێت بۆ شۆڕشێك لە داهاتوودا). واتە بنەمای ڕۆمانەکەی دایڤد بریتییە لە پیشاندانی کاریگەری تاکەکانی کۆمەڵگا لە سەردەمە جیاوازەکاندا، دایڤد لە ڕێگای (سۆنمی)ەوە دووبارەی دەکاتەوە.

ئەو دەڵێت: ژیانمان هی خۆمان نیە، بەو واتایەی ئەو ژیانەی کە ئێمە تێیدا دەژین بە تەنها موڵکی خۆمان نیە، بەڵکو کەسانی تر هەن تێیدا هاوبەشن و ئێمەش بەرپرسیارین تێیدا. دواتر دەڵێت: لە منداڵدانەوە تا گۆڕ، لێرەدا دایڤد جەخت لە گشت قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ دەکاتەوە کە موڵکی ئەو نیە، لە لەدایك بوونەوە تا مردن بە جۆرێك یانی نەك تەنها قۆناغێکی مرۆڤ بە تەنها، بەڵکو تەواوی ژیانی مرۆڤ. دواتر پێمان دەڵێت

ژیانمان موڵکی کێی ترە. دەڵێت : ئێمە بە ئەوانیتر بەستراوینەتەوە، بەو واتایەی ژیانی هەر مرۆڤێك بە مرۆڤێکی تر بەستراوەتەوە، وشەی "ئەوانیتر" بە مانا ئاگاییەکەی (بوون) دێت، واتە کاتێك دەڵێین ئەوانیتر ئەوا باسی بوونەوەرێك دەکەین پێش هەمووشتێك، ئینجا لە نێو بونەوەراندا "عاقل" دەگرێتەوە کە مرۆڤە، بۆیە ژیانی هەر مرۆڤێك پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤێکی تر. دواتر دەڵێت: ڕابردوو و ئێستا، وەك ئەوەی پێمان بڵێت چ کاتێك ئێمە بە مرۆڤی تر بەستراوینەتەوە، ئەو لە وتەکەیدا باس لە کاریگەریەك دەکات کە مرۆڤ لەسەر مرۆڤ هەیەتی، دواتر کە باسی کات دەکات، واتە لەو کاتەدا ئەو کاریگەریە درووست دەبێت، (ڕابردوو و ئێستا). بەو پێیەی مرۆڤ لە ڕابردووەوە بەرەو کاتی ئێستا دەڕوات و ناکرێت لە ئێستادا بەرەو ڕابردوو بڕوات، ئەوا کاریگەری مرۆڤەکان لە ڕابردوو لەسەر ئێستای مرۆڤەکان هەیە، کاتێکیش ئێستا دەبێت بە ڕابردوو، دووبارە کاتێك درووست دەبێت کە لە داهاتووەوە هاتووە و پێی دەڵێین "ئێستا" کە مرۆڤەکان، کاریگەری مرۆڤەکانی ڕابردوویان لەسەر بووە.

دواتر دەڵێت: بە هەر تاوانێك و هەر میهرەبانیەك، داهاتوومان لە دایك دەبێتەوە. وەك ئەوەی لێرەدا مەرج بۆ کاریگەریەکە دابنێت، وەك ئەوەی مەرج لەسەر دروستبوونی داهاتوو دابنێت، دایڤد پێمان دەڵێت کە

هەرگیز ئەو پەیوەندی و کاریگەرییەی مرۆڤەکان لەسەرییەك هەیانە دروستنابێت، تا ئەو کاتەی دوو مەرج تێیاندا نەیەتە جێ، ئەو دوو مەرجە بە واتای دوو لایەنی دێت کە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بوونی هەبووە و دەبێت، هیچ کامێکیشیان بێ ئەویتر ناتوانێت داهاتووی مرۆڤایەتی دروست بکات، ئەو دوو هێزە بریتین لە شەر و ئاشتی، رق و خۆشەویستی، تاوان و میهرەبانی. بە ناوی جیا جیا کە مرۆڤەکان ناویان لێناون، بەلأم لە کۆتاییدا تەنها وەك دوو خاڵی رەش و سپی دەمێننەوە. ئێمە ناتوانین ژیانمان بێ رق بێت و تەنها خۆشەویستی بێت، ناشتوانین ژیانمان تەنها رق بێت و خۆشەویستی لەگەڵ نەبێت، مرۆڤەکان ناتوانن لە هەموو ژیانیاندا میهرەبان بن و تاوان نەکەن، وەك چۆن ناتوانن تاوان بکەن و میهرەبانیش نەبن. دوو هێز کە یەکێکیان ئەویتر تەواودەکات، کە هیچ کامێکیان بێ ئەویتر ناتوانێت بوونی هەبێت. کەواتە دایڤد پێمان دەڵێت ژیانی مرۆڤ تەنها موڵکی خۆی نیە، بەڵکو هی ئەوانەشە کە لە داهاتوودا بەستراونەتەوە بەو، بەهۆی ئەو کاریگەرییەی لەسەر ئەوانی دەبێت، ئەو کاریگەرییەش دروست نابێت تا لە مرۆڤەکە هەڵەیەك یاخود چاکەیەك ڕوونەدات وەك جوڵەیەك.

**"ژیانم هیچ نیە جگە لە دڵۆپە ئاوێك لەناو زەریایەكی بێ سنور، بەڵام زەریا چییە جگە لە تێكەڵەیەكی دڵۆپە ئاو؟"**

ئەو وتەیەی دایڤد، لە گفتوگۆیەكی نێوان دوو كاراكتەری نێو ڕۆمانەكەی درووست دەبێت، كاتێك (ئادەم ئێوینگ) داوای ڕۆشتن دەكات لەو شوێنەی لێیەتی و لەگەڵ خۆیدا هاوسەرەكەی ببات، باوكی هاوسەرەكەی بەوكارە نارازییە و پێی دەڵێت: هەر شتێك بە تەمابیت بیكەی وەك دڵۆپە ئاوێك وایە لە نێو زەریایەكی بێ سنور. ئادەمیش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: بەڵام زەریا چییە جگە لە تێكەڵەیەكی دڵۆپە ئاو؟ دوای وەڵامەكەی باوكی هاوسەرەكەی بە بێدەنگی دەهێڵێتەوە و دەڕوات.
وتەیەكی زۆر جوانە، بچوككردنەوەی گشت شتێكە كە تۆ خاوەنی لەسەرەتادا بەرامبەر هەمووشتێك كە هەیە، دواتر بچوككردنی هەمووشتێكە بەرامبەر گشت شتێك كە تۆ خاوەنی. لێرەدا زەریا بە مانای جیهان دێت، بێ سنووری زەریا واتە بێ سنووری لە ساڵ و تەمەنی جیهان كە هیچ كەسێك نازانێت كەی تەواو دەبێت یاخود سەرەتاكەی كەی بووە، دڵۆپە ئاوێكیش بە واتای ژیانی مرۆڤێك دێت، ژیانی مرۆڤ لە جیهاندا وەك دڵۆپە ئاوێكە لە ناو زەریایەك، ژیانی ئێمە لە چاو ئەو هەموو ژیانە بێ سنوورەی لە داهاتووی جیهانی مرۆڤایەتی دێت وەك ئەو دڵۆپە ئاوە وایە.

لە سەرەتای وتەکەدا، دایڤد بیّ واتایی ژیانی تاکەکەسێك نیشان دەدات بەرامبەر ئەوەی کە هەیە لە جیهاندا، وەك بڵێی چەندەها مرۆڤ دەمرن ڕۆژانە، بەڵام ژیانی جیهانییان هەر بەردەوامە، بۆیە کاریگەریەك درووست ناکات و وەك ئەوەیە بوونی نەبێت، لە ڕۆمانەکەشدا باوکی هاوسەری (ئادەم ئێوینگ) دەیەوێت بڵێت ئادەم ئەو کارەی کە دەیکەیت هیچ گۆڕانکاریەك درووست ناکات، یاخود هیچ گرنگیەکی نابێت. بە وتەیەکی نێگەتیڤ ویستی وره و بوێری ئادەم بشکێنیّ لەوەی کە خەریکە دەیکات.

بەڵام ئادەم هەر زوو وەڵامی دایەوە و گوتی: بەڵام زەریا چییە جگە لە تێکەڵەیەکی دڵۆپە ئاو. ژیان هەر بەردەوامە ئەگەرچی ڕۆژانە بە چەندەها مرۆڤیش لێی کەمبێتەوە، بەڵام ئەسڵەن کیّ ناوی لە ژیان ناوە ژیان؟ کیّ ژیانی ئەو جیهانەی درووستکرد؟ کیّ بەردەوامی بە ژیان دەدات؟ هەموو ئەوانە تەنها مرۆڤە کە منم. هەمووی تەنها ئەو دڵۆپە ئاوەیە کە ئەو زەریایەی درووستکردووە، بۆیە ئادەم دەیەوێت بڵێت: نەخێر تۆ هەڵەی، ئەو کارەی من دەیکەم کاریگەری لەسەر ئەم جیهانە دەبێت، لەسەر ژیانی چەندین کەسیتر کە لەم جیهانە دەژین، بۆیە وەڵامێکی لەم جۆرە جگە لە بێدەنگی هیچ وشەیەکی بەرامبەر ناوتریّ. دایڤد دەیەوێت بڵێت : ئەی مرۆڤ ڕاستە تۆ تەنها دڵۆپێکی لەم جیهانە فراوانە و بیّ سنوورە، بەڵام ئەگەر تۆ نەبیت ئەم جیهانەش نابێت.

# "وێناکردنی کۆتایی جیهان کۆنترین ئارەزووی مرۆڤە"

ڕۆمانی (Cloud Atlas) وەك لە بابەتەکانی پێشوتر باسمانکرد هەڵگری سێ کاتە کە بریتین لە (ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو)، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا تایبەتمەندیەکی تری تێدایە کە لە زۆر فیلمی تردا بە تایبەتی باسیان کردووە، لێرەدا (Cloud Atlas) جگە لەو هەموو تایبەتمەندیەی تر، تایبەتمەندیەکی گەورەی تری تێدایە ئەویش کۆتایی جیهانە (Apocalypse)، ئەمە وشەیەکی یۆنانیە کە لە تێکستەکانی (ئینجیل)وەرگیراوە بە مانای ئیلهام وەرگرتن یاخود شتێکی شاراوە دێت، بەلاّم لە کاتی ئەمڕۆماندا بە واتای کۆتایی هاتنی جیهان بەکاردێت. زۆرێك لە فیلمەکانی هۆلیود لە ئێستادا ئەو بابەتە لەخۆدەگرن و ڕەواجێکی زۆریان هەیە کە هەفتانە بە ملیۆن تەماشاکەری هەیە (بۆیە باسی فیلم دەکەین چونکە وەك لە سەرەتاکان باسمان کرد کە (Cloud Atlas) کراوە بە فیلم و ئێمە لە بنەمای فیلمەکەوە خوێندنەوەی بۆ دەکەین). بەلاّم ئەوەی گرنگە لە هەر فیلمێکی جۆری (کۆتایی هاتنی جیهان–Apocalypse) دا، بریتییە لە پیشاندانی جیهان دوای وێران بوونی( Post-Apocalypse )، کە ئەوە خاڵێکی باوە لە هەر فیلمێکدا، زۆرێك لە

فیلمەکان کۆتایی هاتنی جیهان بەهۆی نەیزەکێکەوە وێنا دەکەن، هەندێکیتر بەهۆی جۆرە ڤایرۆسێکەوە بە ناوی زۆمبی، هەندێکیتر بە بیرۆکەی خەیالآوی و خەیالّی زانستی (Science Fiction)، فیلمی (٢٠١٢) وەك نموونەیەکی زەق لەم جۆرە فیلمانە. بۆیە ئەوەی گرنگ دەمێنێتەوە بریتییە لە جیهان دوای وێرانبوونی، وەك ئەوەی بە خەڵکی بڵێین ئەگەر ڕۆژێك دابێت و جیهان بەرەو وێرانبوون رۆشت، ئەوا دڵنیابن کە هیوایەك دەمێنێتەوە رزگارمان دەکات یاخود مرۆڤایەتی بە هەرشێوەیەك بێت رزگاری دەبێت.

وێناکردنی جیهان دوای وێرانبوونی لە (Cloud Atlas) لە کاتی (داهاتوو) سەردەمی شەشەم، زۆر بەڕوونی دیارە، کاتێك رێژەیەکی کەم لە مرۆڤەکان لەسەر زەوی ماونەتەوە و زەوی بوەتە یەکپارچە لە ڕووەك و سەرتاپای داپۆشیوە، ئەوەش بە مانای نەبوونی مرۆڤ و شارستانی لەسەر زەوی دێت. وەك چۆن پێشتر باسمانکرد، وێرانبوونی جیهان لە ( Cloud Atlas) بەهۆی جەنگێکی فراوانی نێوان مرۆڤەکانەوە بووە کە لە ئەنجامدا مرۆڤ هیچی نەماوەتەوە تەنها خۆی و زەوی نەبێت. ئەو وتەیەی دایڤد گرنگیەکی زۆری هەیە، ئەو دەڵێت مرۆڤەکان حەزدەکەن کۆتایی جیهان ببینن، ڕاست دەکات، وەك باسمان کرد جۆری فیلمی (کۆتایی هاتنی

جیهان-Apocalypse) باوترین جۆره له سینه‌ماکان، ویستێك له ناخی مرۆڤدا هه‌یه، حه‌ز به بینینی کۆتایی مرۆڤایه‌تی ده‌کات، حه‌زده‌کات پێش ئه‌وه‌ی ژیانی ئه‌و ته‌واوبێت، ببینێت که ژیانی ئه‌م جیهانه له‌ناوده‌چێت.

دایڤد ده‌ڵێت کۆنترین ئاره‌زووی مرۆڤه، به‌و واتایه‌ی ئه‌و هیوایه‌ت و حه‌زه هه‌میشه له دووباره‌بوونه‌وه‌یه، دایڤد ده‌یه‌وێت بڵێت که مرۆڤایه‌تی کاتێك تا دوا پله‌ی شارستانیه‌ت ده‌ڕوات، له‌وێوه به‌هۆی جه‌نگێکه‌وه یاخود هه‌ر هۆکارێکی وێرانبوونی جیهان ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ چاخه به‌ردینییه‌کانی خۆی، وه‌ك ئه‌وه‌ی تازه ژیان له‌سه‌ر زه‌وی ده‌ستی پێکردۆته‌وه. بۆیه لای دایڤد ژیان ته‌نها بازنه‌یه‌که کاتێك مرۆڤه‌کان ده‌گه‌ن به‌و شوێنه‌ی له بازنه‌که ده‌ستیان پێکردووه، حه‌ز ده‌که‌ن له سه‌ره‌تاوه ده‌ستپێبکه‌نه‌وه و کۆتایی ئه‌و خوله‌ی بازنه‌که ببینن، به‌ڵام ئه‌و وته‌یه‌ی دایڤد مێژوو ده‌خاته ژێرپرسیاره‌وه، که ئایا ئه‌گه‌ر ژیان ته‌نها بازنه‌یه‌ك بێت، ئیتر وێرانبوونی جیهان له چ کاتێکی ڕابردوو بووه؟ ئایا دوای وێران بوونی ئه‌تلانتیس بووه که زۆرێك له زاناکان واده‌ڵێن، یاخود له ڕووی دینیه‌وه ئه‌و کاته بووه که نوح دوای هه‌ڵگرتنی جوتێك له هه‌موو گیانله‌به‌ران له که‌شتیه‌که‌ی و کۆتای جیهان به‌هۆی لافاوه‌وه بووه؟ یاخود ده‌بێ سه‌ره‌تای دووباره ده‌ستپێکردنه‌وه‌ی مرۆڤایه‌تی که‌ی بوبێت؟ هه‌رچۆنێك بێت ئه‌وه ته‌نها بیرکردنه‌وه‌ی دایڤده به‌رامبه‌ر ژیان و جیهانی مرۆڤایه‌تی .

## "دەوڵەت تا چەند ڕێکخراوتر بێت، هەڵگری مرۆڤایەتییەکی شەکەتتر دەبێت"

(ئالان کلیڤلاند)ی هاوڕێم جارێك گوتی: تا چەند یاساکان لە کۆمەڵگا زیاتر دەبن، زۆرتر تاوان و پێشێلکاری تێیدا درووست دەبێت. ڕاستی دەکرد لە قسەکانیدا، نموونەشی بە وڵاتێکی وەك سویسرا هێنایەوە کاتێك کە هیچ هێزێکی سەربازی نیە، بەڵکو خەڵکەکەی سەربازی وڵاتەکەیانن بە شێوەیەك هەر دانیشتویەکی سویسرا ئاساییە هەڵگری هەر چەکێك بێت بیەوێت، چەکیش بە هیچ شێوەیەك قەدەغە نیە لەوێ و یاسایەکی تایبەتی نیە، لەگەڵ ئەوەشدا سویسرا لەگەڵ ئەو وڵاتانە ناوی دێت کە کەمترین ڕێژەی تاوان و کوشتنی لێ ئەنجام دەدرێت بە ڕێژەی ٠,٧ . هەرچۆنێك بێت ئێمە ئەو کاریگەریەی یاسا دەبینین لەسەر کۆمەڵگا، مرۆڤ حەز بە یاخیبوون دەکات لە ناخەوەی، بۆ تەنها جارێکیش بێت دەیەوێت یاخیبێت لە یاسا، لەو کۆتانەی بۆی دانراوە. گەر سەیری کۆمەڵگا داهاتووەکانیش بکەین دەبینین کەوا لەگەڵ بوونی ئاسایشێکی بەرز هێشتا تاوان و پێشێلکاری بوونی هەیە، یاخود هەر لەو کاتەی ئێستادا تا چەند یاسای نوێ دابنرێت ئەوەندە پێشێلکاری بۆی درووست دەبێت. حەزدەکەم

پێناسەی یاسا لێرەدا بەو شێوەیە بکەم: وەك ئەوە وایە لە خێزانێکدا دایك لەبەر منداڵە بچوکەکانی یاسای قەدەغەکردنی بەکارهێنانی ئاگری لە ماڵەکەیدا بچەسپێنێت، بەڵام ئەی منداڵە گەورەکانی چیبکەن کاتێك پێویستیان پێی دەبێت؟ لە کۆتایدا لە ڕۆژی لە دایکبوونی منداڵێکیان ناچاردەبن یاساکە پێشێل بکەن بۆ ئەوەی مۆمی سەر کێکی ڕۆژی لە دایکبوونەکە داگیرسێنن. بۆ کۆمەڵگاش ئاوایە زۆر جار، کاتێك هەندێك لە تاکەکانی تاوانێك ئەنجام دەدەن، قەدەغەکردنی ئەو شتەی تاوانەکەی پێ ئەنجام دراوە یاخود جۆری کارەکە هەموو کۆمەڵگا دەگرێتەوە.

بەڵام دایڤد جوانتر باسی کردووە، ئەو دەڵێت ئەو یاسایانە تا چەند زۆربن لە کۆمەڵگادا و تا چەند کۆمەڵگا ڕێکخراوتر بێت، لە بەرامبەر ئەوەدا هەستی مرۆڤایەتی شەکەتتر و لاوازتر دەبێت، چونکە پێشێلکاری یاساکان زۆر جار ئەنجامی شکاندنی کەسانی دەوروبەری لێدەکەوێتەوە یاخود کوژرانی مرۆڤی تر لە کۆمەڵگادا لێدەکەوێتەوە. بۆیە دەتوانین بڵێین پێشێلکردنی یاسا هۆکارە بۆ کەمبوونەوەی هەستی مرۆڤایەتی وەك دایڤد باسی دەکات.

ئەو لە ڕۆمانەکەیدا زۆر بە ڕوونی ئەم وتەیەی خۆی چەسپاندووە، کاتێك لە سەردەمی پێنجەم ساڵی (٢١٤٤)، مرۆڤ لەوپەری پێشکەوتن و تەکنەلۆژیا و ڕێکخراوەیی بوون دایە، کۆمپانیایەك مرۆڤ بەرهەم دەهێنێت وەك کۆیلە و خزمەتی ویستەکانی خۆی پێدەکات، لە دوایشدا بەهۆی

ئامێرێکەوە لاشەکەی دەکات بە سوپێك و دەرخواردی ئەو مرۆڤانەی تری دەداتەوە کە درووستی دەکات. ئەوە ئەوپەری نەمانی مرۆڤایەتیە، ئەوپەری لە داستدانی ئەخلاقی مرۆڤبوونە، ئەوپەری بەکارهێنانی مرۆڤە لە پێناو بەرژەوەندیەکانی مرۆڤانی تر. بۆیە دایڤد ئەو کاتانە ناودەبات بە شەکەتبوون و نەمانی مرۆڤایەتی.

وتەکانی دایڤد زۆرن، ئێمە توانای تەنها باسکردنی ئەوانەمان هەبوو کە لە (Cloud Atlas) دا هاتوون، لە کۆتایدا حەزدەکەم گفتوگۆیەکی نێوان (سۆنمی) و ئەو کەسە دابنێم کە لە کۆتایی (Cloud Atlas) لێکۆڵینەوە لە (سۆنمی) دەکات سەبارەت بەو ڕووداوانەی بەسەری هاتوون پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێت.

**لێکۆڵەرەوەکە بە سۆنمی دەڵێت : دوا پرسیارم لێت ئەوەیە، لەگەڵ ئەوەی تۆ دەتزانی کە بزووتنەوەی (یاخیبووانی یەککگرتوو) سەرناگرێت و لەناو دەچن بەڵام بۆچی بەردەوام بوی لەگەڵیان ؟**

**سۆنمی دەڵێت : ئەگەر من بە ونبوویی ببومایەوە، ئەوکات ڕاستەقینەش(حەقیقەت)یش ون دەبوو، منیش ڕێگام بەوە نەدەدا.**

**لێکۆڵەرەوەکە: ئەی ئەگەر هیچ کەسێك باوەڕ بەو ڕاستییە نەکات؟**

**سۆنمی: یەکێك لە ئێستاوە باوەڕی پێکردووە.**

لەم گفتوگۆیەدا زۆر شتی گرنگ و جوانمان بۆ دەردەکەوێت، لێکۆڵەرەوەکە دەڵێت سۆنمی لەگەڵ ئەوەی تۆ دەتزانی کە دەمری یاخود دەتکوژن و لە سێدارەت دەدەن، بۆچی بەردەوامبووی؟ سۆنمی دەڵێت من حەقیقەتم، من هیوام، من ئەو حەقیقەتەم کە ئەگەر بێتوو لە ژیاندا مابم ون دەبووم و کەسیش باوەڕی پێنەدەکردم. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە کەسایەتییە گەورەکانیش هۆکاری ناوبانگی زۆرینەیان دوای مردنیان هات، ئەوان تا نەمرن ئەو حەقیقەتەی هەیانە لێیان ناکەوێت و نادۆزرێتەوە، بۆیە مردن زۆر جار ڕێگا چارەی دۆزینەوەی حەقیقەتە، حەقیقەتی ئامانج و شێوەژیانی مرۆڤە گەورەکان.

## "جیهان : له وێرانبوون(Apocalypse) و دوای وێران بوون (Post-Apocalypse)"

تا ئێستا خەیاڵی کۆتایی جیهانت کردووە؟ یاخود بە هیچ شێوەیەك بیرت لەوە کردۆتەوە کە دونیا چۆن وێران دەبێت؟ ئەی ئەوەی کە دوای وێران بوونی، جیهان چۆن دەبێت؟ ئەوانە چەند پرسیارێکن کە زۆرێك لە فیلمە سینەماییەکان پێشبینیان کردووە و بە جۆرێك لە جۆرەکان پیشانیان داوە. زۆرێك لە خەڵکیش حەز بە بینینی ئەو جۆرە فیلمانە دەکەن و بە شێوەیەك ساڵانە ئەو فیلمانە زۆرترین بینەریان هەیە. وێران بوونی جیهان کە لە فیلمەکان بە (Apocalypse) ناودەبرێت، جۆری زۆرە لە فیلمەکان و بە خەیاڵی جیا جیا وێنای دەکرێت کە دواتر باسیان دەکەین. جۆرێکی تر لە فیلمەکان بریتییە لە فیلمی جیهان دوای وێران بوونی کە بە (Post-Apocalypse) ناودەبرێت، لەو جۆرە فیلمانەدا باسی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ دەکرێت لە دوای وێرانبوونی جیهان و چۆن دووبارە مرۆڤایەتی سەرهەڵدەداتەوە و گەشە دەکات، یاخود چۆن ئەو کەسانەی لە دوای وێران بوونی جیهان رزگاریانبووە، دەژین. ئەوانە ئەو جۆرە فیلمانەن کە لەم سەردەمەدا باون . ئێمە لێرەدا باس لە جۆرەکانی کۆتایی هاتنی

جیهان دەکەین لە بنەمای فیلمەکانەوە و هۆکارەکانیان دەخەینەڕوو، پاشان باسی جیهان دوای وێرانبوونی و جۆری ژیانی مرۆڤەکان دەکەین.

ئەوەی گرنگبێت لەم بابەتەدا بریتییە لە تێگەیشتن و شیکردنەوەی چەند سروشتێکی مرۆڤ لە ئەگەری ئەو کارەساتانەی تووشی دەبێت، چونکە بێگومان هەست و ویست و ئارەزووی مرۆڤ کاردانەوەی ڕووداو و جموجۆڵەکانی دەوروبەرین. جیهانیش دوای وێرانبوونی، کارەساتگەلێکی جۆراوجۆر بەدوای خۆیدا دەهێنێت و چەندین دیاردە سەرهەڵدەدەن کە هیچ کاتێك لە تەمەنی مرۆڤایەتیدا بەم شێوەیە بوونی نەبووە. لەوانە: دیاردەی نەمانی باوەڕ(دین)، دیاردەی مرۆڤ خواردن، دیاردەی نەمانی سیستەمی مرۆیی، دیاردەی تەنیایی و بێ متمانەیی و چەندینی تر. ئێمە لەم بەشەدا باس لە کاردانەوەی مرۆڤ دەکەین بۆ ئەم دیاردانە و هەوڵدەدەین ئەوەی خەیاڵێکی دوورە لەبەدیهاتن، بیخەینەڕوو.

## خاڵی یەکەم :

## "وێرانبوونی جیهان و ڕەنگدانەوەی لە سینەماکان"

وێرانبوونی جیهان، رەگێکی مێژوویی قوڵی هەیە لە هزری مرۆڤدا، بە شێوەیەك مرۆڤ ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر بووە بیر لە کۆتاییەك بکاتەوە، لە ژێر ئەو بنەمایەی کە هەر شتێك سەرەتای هەبێت کۆتاییشی هەیە. تا ئێستا بۆچوونێکی ڕاست لەسەر سەرەتای مرۆڤایەتی نیە تەنانەت سەرەتای گەردوونیش، تەنها هەندێك تیۆری زانستی نەبێت وەك تیۆری بیگ بانگ(Big Bang)، کە تێیدا باس لە سەرەتای دروستبوونی گەردوون دەکات بەهۆی تەقینەوەیەکی مەزن و تێیدا گەردوون بەرەو کشان ڕۆشتووە تا گەرمیەکەی کەمتر بۆتەوە، بە پێی ئەو تیۆرە جیهان تەمەنی ١٣,٧ ملیار ساڵە و دوای چەند ملیار ساڵێك لە دروستبوونی زەوی، مرۆڤ دروستبووە. دەشڵێت کەوا کۆتایی جیهان ئەو کاتەیە کە کشانی گەردوون بەرەو وەستان دەچێت و لە ناکاو هەمووی دەڕوخێت.[٢٠] هەرچۆنێك بێت، ئەو تیۆرە رەخنەی زۆری لێگیرا، یەکێك لەوانە گوتیان بە پێی یاسای گەرمی دینامیکی (thermodynamics law of)، درووستکردنی یاخود لەناوبردنی گشت مادە و وزەیەك مەحاڵە، لە وەلامی ئەوەدا ئەو زانایانەی پاڵپشتی ئەم

تیۆرە دەکەن دەڵێن بیگ بانگ گەردوونی لە نەبوونەوە نەهێناوە، بەڵکو گەردوون هەر هەبووە بەڵام بەهۆی ئەو تەقینەوەیە کشاوە و فراوان بووە. هەرچۆنێك بێت بۆچوونە زانستیەکان هەمیشە لە گۆڕانن، شتانێك نین بتوانرێت پشتیان پێببەسترێ بۆ ئەوەی وەڵامێکی حەتمیت بدەنەوە، لە بەرامبەر ئەوەدا زۆربەی دینە ئاسمانیەکان هاوڕان لەسەر دروستکردنی جیهان لە لایەن خوداوە، بۆ کۆتایی هاتنیشی وەڵامێکی زانستییان پێ نیە بەڵام هەندێك هەن کە نیشانەکانی کۆتایی هاتنی جیهان بە لێکدانەوەی قورئان و بەیەکەوەبەستنی بە زانستی گەردونناسی پێمان دەڵێن کەوا ئەوەی لە ئیسلامدا بە گشتی باسکراوە دەربارەی کۆتایی هاتنی جیهان، بە جۆرێك لەگەڵ زانستدا یەکدەگرێتەوە. ئەوان پێیان وایە وێرانبوونی جیهان، وێرانبوونێکی یەکجاریە، بەو واتایەی دوای وێرانبوونی ژیان نامێنێت و درووستنابێتەوە، کاتی وێرانبوونیشی نادیارە و کەس دەربارەی نازانێت تەنها خودا نەبێت، بەڵام هەرچی بیرۆکەیەکی لە دەرەوەی دین هەیە، پێی وایە ئەو ژیانە بێ سنوورە و ئەگەریش بێتوو وێران بێت بە شێوەیەك، ئەوا مرۆڤ لە شوێنێك هەر سەرهەڵدەداتەوە و دووبارە ژیان درووست دەکاتەوە، ئەوەی لەم فیلمانەش باسکراوە، زۆرینەیان لەسەر ئەو بۆچوونەن. ئێستا

جۆرەکانی چۆنیەتی وێرانبوونی جیهان دەژمێرین و بەپێی نزیکترینیان لە ڕاستیەوە ڕیزی دەکەین:

١- وێرانبوونی جیهان بەهۆی گۆڕانی کەش و هەواوە: ئاگەدارکردنەوەی مرۆڤەکان لە بەرزبوونەوەی ڕێژەی دوانەئۆکسیدی کاربۆن ماوەیەکی زۆرە بوونی هەیە، گۆڕانی کەش و هەوا زۆر جار بە گەرم بوونی جیهانی ناوزەند دەکرێ، بەو واتایەی کە جیهان بەرەو گەرم بوون دەروات لەگەڵ هەر گۆڕانێکی کەش و هەوا، ئەوەش لە ئێستادا هۆکاری زۆرە، کە گشتی مرۆڤەکان درووستکەرین، بۆ نموونە کارگەکان، بڕینەوەی دارەکان، ئۆتۆمبێلەکان، ...هتد. پێشبینی کردنی کۆتایی هاتنی جیهان بەهۆی گۆڕانێکی تەواو لە کەش و هەوا یەکێکە لەو پێشبینیانەی زۆر فیلمی لەسەر دەرهێنراوە، بۆ نموونە (WaterWorld) کە تێیدا باس لە تێکچوونی جیهان دەکات لە داهاتوودا کە ساڵەکەی نزیکەی بۆ ساڵی ٢٥٠٠ دەگەڕێتەوە ، کاتێك بەستەڵەکی باکور و باشور بەهۆی بەرزی پلەی گەرمیەوە تواوەتەوە، بەم شێوەیەش بووەتە هۆی پەیدابوونی زریان و لافاو، تا ئەو کاتەی ئاو هەموو شوێنێکی داپۆشیوە. یان فیلمی ( The day After Tomorrow) کە تێیدا باس لە ساردبوونی کەش و هەوای جیهان دەکات، بە شێوەیەك کە جیهان گەڕاوەتەوە بۆ چەرخی بەستەڵەك، لە

فیلمی (The Colony)یش هەمان پێشبینی کراوە، کاتێك هەمووشتێك بەستویەتی و مرۆڤەکان بە حاڵ دەتوانن کار بکەن یاخود بجولێن. گۆڕانی کەش و هەوا تا ئێستا نزیکترین بیرۆکەیە بۆ کۆتایی هاتنی جیهان، چونکە هەم لە ئێستادا بوونی هەیە و هەم ئەگەری ڕوودانیشی هەیە لە داهاتوودا. تا ئێستا زۆرێك لە ڕێکخراو و کۆمپانیا دروستبوون بۆ پارێزگاریکردن لەو بابەتە و بە گرنگ پیشاندانی.

٢- وێرانبوونی جیهان بەهۆی جەنگەوە : یەکێکە لەو خاڵانەی کە زۆر وەك هۆکارێکی وێرانبوونی جیهان نیشاندراوە لەو فیلمانەی باس لە ژیان دوای وێرانبوونی جیهان دەکەن. جەنگی جیهانی یەکێکە لە گەورەترین ئەو کارەساتانەی بەسەر مێژووی مرۆڤایەتیدا هاتووە کە مرۆڤ خۆی دروستکەری بووە. جەنگە جیهانییەکان زۆرێك لە بیری مرۆڤەکانی گۆڕی، وایلێکردن کە بیربکەنەوە لەوەی کە مرۆڤ شایەنی کوشتن نیە، وایلێکردن کە بیربکەنەوە ڕەگەزپەرستی یەکێکە لە خاڵە لاوازەکانی مرۆڤایەتی، هەموو ئەوانە هێندە کۆن نین، ئەم بیروڕایانە بەرهەمی دوای دوو جەنگی گەورەی جیهانین. گەر ڕۆژێك مرۆڤایەتی لەو شارستانیەتەی ئێستا بگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی دواوە و چاخە کۆنەکان، ئەوە بەهۆی جەنگەوەیە. لە ئێستادا دروستبوونی جەنگی جیهانی سێیەم باسێکە و زۆرجار قسەی لێوە دەکرێ

بەهۆی هەبوونی ململانێی نێوان ولاّتان لەسەر بۆمبی ئەتۆمی لەم سەردەمەدا. ململانێیّ ئێران و ئەمریکا، تورکیا و ئێران، کۆریای باکور و ئەمریکا، بەهاری عەرەبی. بۆیە لە هەموو ئەگەرێکدا هەر هەنگاوێکی هەڵە دەکریّ ئەم کارەساتە دووبارە بخولقێنێت. مرۆڤ لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست دا هەست بە ئاسایش ناکات، هەست ناکات سەربەخۆییانە دەژی چونکە ژیانی جێگیر نیە. ئەگەرچی جەنگی جیهانی یەکەم و دووم وانەی باشی دا بە مرۆڤایەتی، بەلاّم بەرژەوەندی ولاّتان زۆر جار گەورەترە لەوەی کە مرۆڤایەتی دەیەوێت. جەنگی جیهانی سێیەم بە پلە یەك لە دەست ئەمریکایە، ئەو هەم دەتوانێت هەمووشتێك بوەستێنێت، هەم دەشتوانێت هەمووی تێکبدات. بە پلە دوو لە دەست ئێرانە، یاخود ئەو ولاّتانەی هەرەشەی هێرشکردن دەکەن بە بۆمبی ئەتۆمیەوە، کۆریای باکور بۆ نموونە. بەلاّم هەرچۆنێك بێت تا ئێستا خۆیان بەدووردەگرن لێی. لە زۆر فیلمدا کاتێك باسی ئەمریکا یاخود ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست دەکرێت، ئەو سەرۆکە ئەمریکیە لە فیلمەکەدا بڕیاری کشانەوەی گشت هێزەکانی دەدات لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست، یاخود هەوڵی بەستنی پەیمانێکی نێودەوڵەتی دەدات لەگەڵ ئێران و ولاّتە ناکۆکەکان، بەلاّم وەك هەمیشە لە فیلمەکەدا هەوڵی سەرنەگرتنی ئەو پرۆسەیە دەدەن، بۆ نموونە لە فیلمەکانی وەك

(White House Down) و (Vantage Point). له هەر بارێکدا، مەترسیەکە ئەمجارە زیاتر لەسەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە نەوەك شوێنێکی تری جیهان. دوو نموونەی ئەو فیلمانەی کە جیهان کۆتایی هاتووە تێیدا بەهۆی جەنگەوە: (The book of El) و ( The Divide).

٣- وێرانبوونی جیهان بەهۆی بلاوبونەوەی ڤایرۆس: یەکێکیتر لەو پێشبینیانەی کە لە چەند فیلمێکدا پیشاندراوە بریتییە لەوەی کاتێك جۆرە ڤایرۆسێکی بەهێز و نویێ بلاودەبێتەوە و دەبێتە هۆی مردنی خێرای مرۆڤەکان یاخود دەبێتە هۆی کۆنترۆلکردنی ئەقلێ و کردەوەکانی. هەلبەت ئەمە بەربلاوترین جۆری ئەو فیلمانەیە، چونکە شێوازی زۆرە، بۆ نموونە بلاوبوونەوەی ڤایرۆسێك کە هەلگری جۆرە نەخۆشییەکی نوێیە، تا مرۆڤایەتی هەولێ دروستکردنی دەرمان دەدات، لە ناوی دەبات، یاخود هەڕەشەی بلاوبوونەوەی جۆرە ڤایرۆسێك کە تەنها لە چەند مانگێك توانای کۆتایی هێنانی ژیانی هەیە لە زەوی، وەك لە فیلمی ( The Satan Bug) ئاماژەی پێکراوە، یاخود لە فیلمی (Contagion) کە هەمان باسە. بۆیە لە سێیەمین خالمان دانا، چونکە بە بەراورد لەگەلێ پێشبینییەکانی تر بۆ داهاتوو خالێکی بەهێزە، گەر سەیر بکەین نیو سەدە

بەر لە ئێستا زۆرێك لەو نەخۆشیانەی کە ئێستا هەیە بوونی نەبووە، یاخود نەدۆزرابویەوە، بۆیە لە داهاتووشدا ئەگەری بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی تر هەیە کە ببێتە هۆی نەخۆشییەکی ترسناکی لەم جۆرە.

٤- وێرانبوونی جیهان بەهۆی بەرکەوتنی هەسارەیەك بە زەوی: زۆرێکمان بەم جۆرە پێشبینییە ئاشناین، کەس نیە بۆ جارێکیش گوێی لە پێشبینییەکەی ساڵی ٢٠١٢ نەبوبێ دەربارەی کۆتایی هاتنی جیهان بەهۆی بەرکەوتنی هەسارەیەك بە زەویەوە، تەنانەت خەڵکێکی زۆریش بڕوای پێکردبوو و زۆرێك ماڵەکانیان بەجێهێشت بۆ چوونە ئەو شوێنانەی کە گوایە پارێزراو دەبن لێی. بەهەرحاڵ ئەو بەروارە تێپەڕی کە هۆزێك بە ناوی مایا لە ئەمریکای باشور چەندین ساڵ بەر لە ئێستا پێشبینیان کردبوو، هیچ شتێکیش ڕوویندا. فیلمی زۆر لەم بارەیەوە دەرهێنران، ناوبانگترینیان فیلمی ٢٠١٢یە، بەڵام هەمان پێشبینی نەبوو کە بۆ کۆتای هاتنی جیهان لە ٢٠١٢ کرابوو، چونکە لە فیلمەکە کۆتای هاتنی جیهان بەهۆی ڕووداوە سروشتییەکانەوەیە، بەهۆی گۆڕانی کەش و هەواو بڵندبوونەوەی پلەی گەرمی ژێرزەوی و تەقینەوەی بورکانەکانەوەیە. بەڵام نموونەی ئەم جۆرە پێشبینییە لە فیلمی (Knowing) دەبینین، کاتێك زەوی بەهۆی بەرکەوتنی تیشکە گەرم و بڵێسەدارەکانی خۆرەوە دەسوتێت و گشتی لە

ناو دەچێت. بەڵام هەر لەم فیلمەشدا باس لە چۆنیەتی رزگاربوونی مرۆڤایەتی دەکرێت لە لایەن "بیانییەکانەوە" (جۆرە دروستکراوێکی تر کە لە هەسارەی ترەوە هاتوون بۆ سەر زەوی). بۆیە ئامانجی گشتی فیلمەکە پیشاندانی رزگاربوونی مرۆڤایەتیە دوای وێرانبوونی زەویش. ئەو پێشبینییە تا چەند ساڵێك بەر لە ئێستا یەکێك بوو لە هەرە پێشبینییە گرنگەکان بۆ کۆتای هاتنی زەوی بەڵام دوای تێپەڕینی ساڵی ٢٠١٢، ئەو پێشبینییە بە شێوەیەکی گەورە پاشەکشەی کرد، ئێستاش یەکێکە لەو پێشبینیانەی کە بە ئەستەم کاری لەسەر دەکرێ لە سینەماکاندا.

٥- وێرانبوونی زەوی لە لایەن بیانییەکانەوە (UFO, Aliens):

خەڵکێکی یەکجار زۆر هەیە بڕوای بە هەبوونی دروستکراوی ترە لەسەر هەسارەکانی تر جگە لە زەوی، هەندێکیش پێیان وایە چەندین جار تا ئێستا سەردانی زەویان کردووە و شارستانیەتی مرۆڤایەتیان بینیوە، ئەو بڕوایەش شتێکی نوێ نیە، بەڵکو بینینی (تەنە فڕیوە پێناسەنەکراوەکان) بە کورتکراوەی (UFO)، مێژوویێکی درێژی هەیە، کە یەکەم بینینی بۆ ساڵی ١٨٧٨ دەگەڕێتەوە کاتێك جوتیارێك بە ڕۆژنامەیەکی راگەیاند کە تەنێکی بازنەیی فڕیوی بینیوە لە ئاسمان و بە خێراییەکی زۆرەوە ڕۆشتووە.[٢١] لەو کاتەوە چەند ساڵ جارێك لەم راپۆرتانە بڵاودەبوویەوە لە نێو خەڵکیدا،

سەیرەکەش لەوەدایە کە ئەوانەی بینیویانە لە ولآتانی جیاواز جیاوازن و هەمان پێناسەیان بۆ تەنە فریوەکان کردووە کە بینیویانە. لە جیهانی ئەمرۆشمان گەر سەیربکەین دەبینین کە ماڵپەرەکان پڕیەتی لەم جۆرە ڤیدیۆیانە کە تێیدا تەنە فڕیوەکان پیشان دەدات، بەڵام زۆرێکی ساختەن و زۆری تریش گومانیان لەسەرە، بە زۆربوونی راپۆرتی درۆینە و ڤیدیۆی دروستکراو، خەڵکی چیتر بڕوای بە بوونی شتێکی لەو جۆرە نەما، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە دەڵێن بە چاوی خۆمان بینیومانە یاخود بڕوایان بە بوونی دروستکراوی تر هەیە لەسەر هەسارەکانی تر. وەك هەر بابەتێکی تر، بلآوبوونەوەی ئەو دەنگۆیانە کار لەسەر فیلم و سینەما دەکات، تا ئێستا چەندین فیلم لەم بارەوە دەرهاتووە و زۆری باسکردنە لە هێرشکردنی بیانیەکان بۆ سەر زەوی وێرانکردنی، نموونەی ئەو فیلمانەش:

War of the Worlds, Skyline, Independence )

Day) ئەوانە و چەندانی تر. بەلآم ئایا هەر بەڕاست دەکرێ ڕۆژێك بێت تووشی هەرەشەی بیانیەکان بین؟ یاخود ئایا ئەوان هەر بونیان هەیە تاوەکو هێرش بکەن؟ زۆرێك دەڵێن کە گوایە حکومەتی ئەمریکی ڕاستیەکە دەزانێت بەلآم دەیشارێتەوە. (Area ٥١) ئەو بنکە سەربازیە نهێنیەی کە تا ئێستا چەندین فیلمی سینەمای و دیکۆمێنتاری لەسەر دەرهێنراوە،

زۆرێك پێیان وایە ئەو بنکەیە شوێنی شاردنەوەی هەر بەڵگەیەکە کە بسەلمێنێت بیانیەکان بوونیان هەیە. ئەگەر بوونیشیان هەبێت، ئایا وەك ئەو فیلمانەی باسمان کرد هێرش دەکەنە سەرمان و ویستی وێرانکردنی زەویان هەیە؟ یاخود بە ئاشتی دێن و یارمەتی مرۆڤایەتی دەدەن، وەك لەو فیلمانە ئاماژەی پێکراوە : ( E.T. the Extra-Terrestrial, ٩ District) یاخود وەك لە فیلمی (Knowing) کە تەنانەت دەبن بە رزگارکەری مرۆڤایەتی. هەرچۆنێك بێت، ناتوانین وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە تا ئەوکاتەی دڵنیا دەبین لە بوونیان یاخود نەبونیان.

٦- وێرانبوونی جیهان بەهۆی تەکنەلۆژیای دژە-مرۆڤ: ئەو خاڵە لە بابەتی "ترس لە تەکنەلۆژیا"دا باس دەکەین دواتر، بەڵام لێرەدا وەك یەکێك لە پێشبینییەکانی کۆتایی هاتنی جیهان باسی دەکەین. کاتێك تەکنەلۆژیا دەگاتە ئەو ئاستەی دەتوانێت بیربکاتەوە و بیرۆکە درووستبکات یاخود بە جۆرێکیتر کاتێك مرۆڤایەتی دەگاتە ئەو ئاستەی زیرەکی دەستکرد (Artificial Inetelligence)دابهێنێت، ئەوکات مرۆڤایەتی ترسی لەناوچوونی لێدەنیشێت لە لایەن ئامێرەکانەوە. زنجیرە فیلمی (Terminator) نموونەیەکی گەورەی ئەو باسەن، کاتێك تۆرێکی تەکنەلۆژی فراوان و خاوەن عەقڵ بە ناوی (Skynet ) دەست دەکات بە

دروستکردنی ئامێر لە شێوەی مرۆڤ بۆ کوشتن و لەناوبردنی مرۆڤ. دوای لەناوچوونی زۆرینەی مرۆڤایەتی، کۆمەڵێك دەمێنن کە دژی ئەو تۆڕە دەجەنگن و بەرەنگاری دەبنەوە. بۆیەش ئەم بابەتەمان لە خاڵی شەشەم دانا، چونکە یەکێکە لە پێشبینییە هەرە دوورەکان بۆ کۆتایی هاتنی جیهان یاخود نەمانی مرۆڤایەتی، خودی خۆشم بڕوام بە دروستبوونی (زیرەکی دەستکرد) نییە. هەروەها ئەم نموونەیە لە فیلمی نوێی وەك (Oblivion)یش دەبینین، کە تێیدا (تۆم کروز) رۆڵی سەرەکی دەبینێت بە ناوی (جاك هارپەر)، جاك ئەو کەسەیە کە بە شێوەیەك بەرهەم هاتووە لە لایەن تۆڕێکی ئەلیکترۆنی جیهانیەوە بە ناوی (Tet)، هەوڵی لەناوبردنی مرۆڤەکان دەدات بەهۆی (جاك)ەوە، واتە بەهۆی خودی مرۆڤەوە. فیلمەکە چیرۆکێکی سەرنجڕاکێش و بابەتێکی نوێیە.

٧- وێرانبوونی جیهان لە بنەما دینییەکان: ئەو پێشبینییە دینییەی بۆ کۆتایی هاتنی جیهان دەکرێت، دەکرێت وەك سەرەتای دروستبوونی جیهانەوە، نزیکترین پێشبینی بێت لە ڕاستیەوە، بەلاّم بەهۆی جیاوازی بۆچوونە دینییەکان لەبارەی شێوازی کۆتایی هاتنی جیهان، زۆر بە کەمی لە فیلمە سینەماییەکان دەبینرێن، ئەگەر هەشبن ئەوە لە بنەمای دینی کریستانیە(مەسیحیەت)ە، وەك لە فیلمی (Omen) و بەشەکانی تری،

یاخود وەك فیلمی (End Of Days) كە باس لە هاتنی دەجال یاخود شەیتان دەكات بۆ ویرانكردنی جیهان، بەلام بەهۆی هەندیك كەسەوە ناتوانن ئەوە بكەن.

٨-هەندێك لە پێشبینییە خەیالاویەكان: دوای باسكردنی حەوت خالّ لەو پێشبینیانەی لە فیلمەكان كرابوون دەربارەی كۆتایی هاتنی جیهان یاخود وێرانبوونی(Apocalypse )، ئێستا باسی هەندێك فیلم دەكەین كە باس لە چۆنیەتی كۆتایی هاتنی جیهان و مرۆڤایەتی دەكەن بەلام تا ڕادەیەكی زۆر دوورن لە ڕاستی و پشتیان پێنابەسترێت. لە فیلمی (Daybreakers) باس لە داهاتوویەك دەكات كە تێیدا مرۆڤەكان گشتیان بوون بە خوێنمژ، تەنانەت گشت سیستمی ژیان گۆڕاوە و بە شێوەیەكی لێهاتووە كە بۆ خوێنمژەكان بگونجێت، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەندێك مرۆڤ ماون كە نەگۆڕاون بۆ خوێنمژ و بە شێوەیەكی شاراوە دەژین و هەوڵ بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك دەدەن كە بتوانن بەهۆیەوە مرۆڤ لە خوێنمژەوە بكەنەوە بە مرۆڤ، لەم پێناوەشدا پەنا بۆ لێكۆڵەوەرێكی خوێنمژ دەبەن بە ناوی (ئدوارد دالتۆن)بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات و دووبارە مرۆڤایەتی بگەڕێننەوە. ئەم فیلمە تا ڕادەیەكی زۆر لە ڕوودانی و ڕاستی دوورە، بەلام وەك خەیاڵێكی زانستی، مایەی خۆشی بینەرانی بوو. فیلمێكی

تر بە ناوی (The happening) کە تێیدا باس لە بڵاوبوونەوەی جۆرە ڤایرۆسێك دەکات لە هەوادا، توانای کۆنترۆلکردنی هەموو لاشەی مرۆڤی هەیە، کاتێکیش مرۆڤێك توشی دەبێت، بێ ویستی مرۆڤەکە، وای لێدەکات خۆی بکوژێت. ئەم فیلمە سەرکەوتنێکی وای بەخۆیەوە نەدی و لە زۆر لایەنەوە رەخنەی لێگیرا، بە تایبەت لە لایەنی چیرۆکی فیلمەکەوە، رەخنەگران چیرۆکەکەیان بە شتێکی بێ مانا ناوبرد کاتێك دوای هەوڵدانێکی زۆری خێزانێك بۆ ڕزگاربوون لەو ڤایرۆسە و دوورکەوتنەوە لەو هەوایەی گومانی بوونی ئەو ڤایرۆسەی لێدەکرێت، لە کۆتایدا هەواڵی ئەوە بە خەڵکی دەدرێت کە ڤایرۆسەکە نەماوە و ئێستا خەڵکی دەتوانن هەم لە ماڵەکانیان هەم لەو شوێنانەی بۆی ڕۆیشتوون بگەڕێنەوە. کەچی لە کۆتایی فیلمەکە دەبینین کە دووبارە ئەم ڤایرۆسە دێتەوە. ئەو جۆرە پێشبینییە بۆ کۆتایی هاتنی مرۆڤایەتی، جگە لە خەیاڵێك هیچ ڕێگایەکی نیە ببەسترێتەوە بە خاڵێکی واقعی جگە لەوەی کە دەکرێ نەخۆشییەك سەرهەڵبدات و کوشندە بێت بەڵام وەك ئەوە نا وا لە مرۆڤ بکات خۆی بکوژێت. خاڵێکی تر کە لە زۆر فیلمدا باوە، بوونی زۆمبیە، هیچ کەسێکمان نیە گوێی لە وشەی "زۆمبی" نەبوبێ و فیلمێکی لە بارەوە نەدیبێت. دواین فیلم لەسەر ئەم بابەتە بێت، فیلمی (World War Z)ە لە ئێستادا، کاتێك بەهۆی

ڤایرۆسێکەوە مرۆڤەکان سروشت و عەقڵی خۆیان لە دەست دەدەن و وەك ئامێرێکیان لێدێت کە ئەو ڤایرۆسە کۆنترۆڵی دەکات. وەك دەزانین باوترین کاری ئەو زۆمبیانەش مرۆڤ خواردنە یاخود گۆڕینی مرۆڤە بۆ زۆمبی کە ئەوەش یەکێکە لە هێماکانی لە ناوچوونی مرۆڤایەتی و وێرانبوونی زەوی.

یەکێکیتر لە پێشبینییە خەیاڵاویەکان، بریتییە لە وێرانبوونی جیهان بەهۆی گیانلەبەرێکی گەورەوە، جا ئایا ئەو گیانلەبەر دایناسورێکە یاخود شتێکی جیاوازتر، ئەم پێشبینییە لە کاتی خۆیدا زۆر باوبوو. فیلمی (Godzilla) و زنجیرە فیلمی (Jurassic Park) نیشانەی ئەو جۆرە فیلمانەن. دواین فیلم لە ئێستادا لەم شێوەیە دەرهێنرابێت، فیلمی ( Pacific Rim)ە، کە خاوەن چیرۆکێکی جوانە و سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوە.

ئەوانەی باسمانکرد، کۆمەڵێك لەو پێشبینیانەن بۆ چۆنیەتی وێرانبوونی جیهان(Apocalypse) لە داهاتوودا و لە بنەمای فیلمە سینەماییەکانەوە، گرنگی زانینیان بۆ ناسینەوەیانە لە کاتی بینینی هەر جۆرە فیلمێکی (Apocalypse).

## خاڵی دووەم:

## "جیهان لە دوای وێرانبوونی(Post-Apocalypse)"

دوای خستنەڕووی چەند جۆرێك لەو پێشبینیانەی بۆ کۆتاهاتنی جیهان کراوە لە فیلمەکانەوە، ئێستا باس لە چۆنیەتی شێوەژیانی مرۆڤ دەکەین لە دوای وێرانبوونی جیهانەوە کە لە چەند لایەنێکی جیاوازەوە خوێندنەوەمان بۆ کردووە.

جیاواز لە پێشبینی دینی بۆ کۆتایی هاتنی جیهان و وێرانبوونی، کە دەگوترێ دوای وێرانبوونی جیهان ئیتر هیچ شتێك نامێنێتەوە و هەموو شتێك تەواو دەبێت و ڕۆژی سزا دەست پێدەکات. پێشبینییەکانی تر هەموویان لەگەڵ ئەوەن کە لە دوای وێرانبوونی زەویش یاخود نەمانی مرۆڤایەتی هێشتا چەند هیوایەك ماوە بۆ مرۆڤایەتی کە دوای وێرانبوونی جیهان رزگاری بێت و دووبارە دەستبکاتەوە بە ژیان و هەوڵی دروستکردنەوەی شارستانیەت بدات. لە فیلمەکاندا، ژیان دوای وێرانبوونی جیهان (Post-Apocalypse) زۆر ڕەهەندی جیاوازی هەیە، بە شێوەیەك ئەو ژیانەی کە مرۆڤ تێیدایە پێش لە وێرانبوونی زەوی، بەندە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ چۆن ژیانێك دەژێت دوای وێرانبوونی. واتە شێوازی

وێرانبوونی زەوی کاریگەرە لەسەر ئەو جۆرە ژیانەی مرۆڤ دەیبێت لە دوای وێرانبوونی. بۆ نموونە ئەگەر زەوی بەهۆی گۆڕانی کەش و هەواو گەڕانەوە بۆ چاخی بەستەڵەک وێران بێت، ئەو ژیانەی مرۆڤەکان دەیانبێت بریتی دەبێت لە ژیانێك کە پڕیەتی لەو ڕووداو و دەرکەوتانەی بەهۆی بەستەڵەکەوە تووشی مرۆڤ دێن. هەروەها بە هەمان شێوە بۆ جۆرەکانی تریش.

لەگەڵ ئەوەشدا، ڕووداوگەلێك هەن لە هەر جۆرە ژیانێك کە مرۆڤ دەیبێت دوای وێرانبوونی زەوی وەکو یەکە، بۆ نموونە لە هەموو جۆرەکانی ژیان دوای وێرانبوونی زەویدا، مرۆڤ توشی برسییەتی دەبێت، توشی دەربەدەری و ناچار بە تەنیایی و بێ باوەڕی دەبێت. چەندان شتی تریش، گرنگ ئەوەیە باسکردنی ئەم بابەتانە هەڵگری پەیامگەلێکی فیکری و فەلسەفین لەدواوەی ئەو سروشتەی مرۆڤ هەیەتی وەك کاردانەوەیەك بۆ ئەو دیاردە و ڕووداوانەی دێنە پێشەوەی لە وەها جیهانێکدا.

## "دواین مرۆڤ لە ژیاندا: نموونەیەکی جیاواز لە فیلمی (I am Legend)"

(I am Legend) یەکێکە لەو فیلمە بەناوبانگانەی باس لە جیهان دوای وێرانبوونی(Post-Apocalypse) دەکات. ئەم فیلمە لە دەرهێنانی (فرانسیس لاورێنس)ە و لە ساڵی ٢٠٠٧ بەرهەمهێنراوە، کاردانەوەیەکی باشی هەبوو و زۆرێك لە ڕەخنەگرانی فیلم بە فیلمێکی نایاب وەسفیان کرد.

چیرۆکی ئەم فیلمە باس لە پیاوێك دەکات بە ناوی دکتۆر (رۆبێرت نێڤیل) کە (وێل سمیس) ڕۆڵەکەی گێراوە، بەهۆی بلاوبوونەوەی جۆرە ڤایرۆسێك کە مرۆڤ دەکات بە زۆمبی، مرۆڤایەتی زۆرینەی لەناودەچێت. لەم نێوەندەشدا لە شاری نیو یۆرك، تەنها پیاوێك مابێتەوە بە زیندوویی بۆ چەندین ساڵ، تەنها (رۆبێرت نێڤیل) ە. (رۆبێرت) دوای مردنی خێزانەکەی، بڕیار دەدات لەم شارە بمێنێتەوە و دژ بەو ڤایرۆسە بجەنگێت تا ئەوکاتەی چارەسەرێك دەدۆزێتەوە بۆی. چونکە (رۆبێرت) جگە لەوەی سەرکردەیەکی سەربازییە، جۆرێك لە پزیشکی دەزانێت و لەم ماوەیەی کە بە تەنها دەمێنێتەوە هەوڵی دروستکردنی دەرمانێك دەدات کە بتوانێت ئەم

ڤایرۆسە لەناوببات و زۆمبی بکاتەوە بە مرۆڤ یاخود بە جۆرێك چارەسەری ئەم نەخۆشیە بدۆزێتەوە. هەرچەندە لە فیلمەکەدا زۆر بە ڕێکی باسی ئەوە نەکراوە، بەڵام بە تێبینی کردن بۆمان دەردەکەوێت کە (رۆبێرت) چەندین ساڵ دەبێت بە تەنیا دەژێت تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبێت هیچ کەسێك لەم شارە نەماوە تەنها خۆی نەبێت، بەڵکو تا دەگاتەو ئەو باوەڕەی کە هیچ کەسێك لە ژیاندا نەماوە تەنها (رۆبێرت) نەبێت. هەرچەندە تەواو بێ ئومێد نەبووە، ئەو لە هەمان کاتدا هەوڵی دۆزینەوەی کەسانی تر دەدات بەهۆی پەیامێکی رادیۆییەوە کە ڕۆژانە دووبارە دەبێتەوە و تێیدا دەڵێت کە ئەگەر هەر کەسێك زیندوو ماوە، با بێت بۆ ئەو شوێنە(لە فیلمەکە دەستنیشانی کردووە) و من دەتوانم هەمووشتێکی بۆ دابین بکەم. دوای بەسەرچوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو پەیامە و نەهاتن و دیارنەبوونی هیچ کەسێك وا لە (رۆبێرت) دەکات کە ئیتر بێ هیوا بێت لە دۆزینەوەی هیچ مرۆڤێکی تر و وای لێدەکات دڵنیابێت کە تاکە کەسە ماوەتەوە لەم جیهانەدا.

(رۆبێرت) بە شێوەیەکی تەواویش تەنها نیە، ئەو لەگەڵ سەگەکەی دەژێت. خاڵێکی تر لێرەدا کە بەهۆیەوە (رۆبێرت) توانیویەتی کاتێکی زۆر بە تەنها بمێنێتەوە، ئەوەیە کاتێك کوڕەکەی پێش ئەوەی بمرێت، سەگەکە بە باوکی دەدات، لەوێدا سەگەکە زۆر بچوکە، بەڵام دوای پیشاندانی

دیمەنەکانی تر لە فیلمەکە دەردەکەوێت سەگەکە چەند گەشەی کردووە و گەورە بووە. بەهەرحاڵ خاڵێکی بەهێزی مانەوەی (رۆبێرت) بریتییە لە سەگەکەی، چونکە وەك دوایین مرۆڤ دەبێت کەسێکی هەبێت بۆی بژێت، بۆ ئەویش، سەگەکەیەتی.

ئەمانە گشتی دوای هەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە زۆمبی دێن لەم شارە، کە ناتوانن بە ڕۆژ بێنە دەرەوە بەهۆی تیشکی خۆر و تەنها لە شەودا هێرش دەکەن، ژمارەکەیان ئەوەندە زۆرە کە کاتێك دێنە دەرەوە دەنگەکەیان زۆر بەرزە، بە شێوەیەك (رۆبێرت) شەوانە ناچارە بچێت لە گەرماوەکە بخەوێت. هۆکاری زیندوو مانەوەی (رۆبێرت) لەم شارەدا تەنها هۆشیاری ئەوە، ئەو هەژماری هەموو هەنگاوێکی کردووە، بۆ نموونە چوونە دەرەوەی لە کاتێکی بەیانی دیاریکراوە، هاتنەوە ماڵەوەشی کاتێکی دیاریکراوە کە پێش ئەوەی شەودا بێت. جۆرێك لە شلەیەك دەپرژێنێتە پێش ماڵەکەی بۆ ئەوەی زۆمبیەکان هەست بە بوونی مرۆڤێك نەکەن، جگە لەوەش ئەو سیستمێکی تۆکمەی پاراستنی داناوە لە کاتی هێرشکردنی ئەو زۆمبییانە و ئاشکرابوونی ئەو لەو ماڵە. ئەوەش لە کۆتاییەکەی دەبینین. (رۆبێرت) دوای گەڕانێکی زۆر بەدوای چارەسەر بۆ ئەم ڤایرۆسە و تاقیکردنەوەی دەرمانەکانی لەسەر چەندین مشك، لە یەکێکیان

دەردەکەوێت کە سەرکەوتوو بووە و توانیویەتی مشکێك لە زۆمبییەوە بگەڕێنێتەوە سەر سروشتی خۆی، بۆیە بڕیار دەدات ئەم جارە لەسەر زۆمبیەك تاقیبکاتەوە. بۆ ئەوەش هەڵدەستێت بە گەڕان بەدوای زۆمبییەك و گرتنی بە زیندوویی.

حەز دەکەم لێرەدا خاڵێکی جیاوازی نێوان زۆمبی لەم فیلمەدا لەگەڵ فیلمی تر بڵێم، ئەویش ئەوەیە کە زۆمبی لێرەدا جۆرێك لە هۆشیاری ئەقڵی تێدا ماوە، واتە دەزانێت کە چی دەکات و چی ناکات، واتە دەتوانێت بە جۆرێك لە جۆرەکان بیربکاتەوە. بەڵام ئەوە لە هیچ فیلمێکی تر نابینین، بۆیەش هەر دوای گرتنی یەکێك لە زۆمبیەکان و تاقیکردنەوە لەسەری، زۆمبیەکان هەوڵی تۆڵەکردنەوە دەدەن، لەوەشدا سەرکەوتوو دەبن. بەڵام دواجار دەبێتە هۆی لە دەستدانی تاکە هاوڕێی (رۆبێرت) کە سەگەکەیەتی، بەوە زۆر دڵگران دەبێت و جۆرێك لە کاردانەوە درووستدەکات لای و هەمان شەو هەوڵی تۆڵەکردنەوە دەدات، هەر هەمان شەو کاتێك زۆری نەماوە زۆمبیەکان پێی بگەن و بیکوژن، کەسێك رزگاری دەکات و دەیباتەوە ماڵەوە. لێرەدا (رۆبێرت) گەورەترین نهێنی ژیانی بۆ دەردەکەوێت، ئەویش بریتییە لەوەی کە جگە لەو مرۆڤی تر ماون لە ژیاندا. بۆیە دووبارە ئومێدی بەردەوامبون لە ژیاندا لە دڵی دەچەسپێت. ئەو کەسانەی یارمەتیان داوە بریتین لە کچێك و منداڵێك بە ناوی (ئانا و ئیزەن)، کە پێی دەڵێن گوایە

ئەوان لە بەڕازیلەوە هاتوون و کاتێك گوێیان لە پەیامە رادیۆییەکەی (رۆبێرت) بووە و بەدوایدا هاتوون. ئەوان دەڵێن کەوا کۆمەڵگەیەکی گەورە هەیە لەسەر گردێك هەر لە شاری نیو یۆرك لەوێدا خەڵکێکی زۆر دەژێت و بەرگری و ئاسایشەکی زۆر بەهێزی هەیە، (رۆبێرت) بەم قسەیە زۆر توڕە دەبێت، چونکە ئەو چەندین ساڵە لەم شارە دەژێت و تا ئێستا هیچ کەسێکی نەدۆزیوەتەوە و کەس یارمەتی نەداوە و توشی بێ هیواییەکی زۆر بووە. بۆیە بڕوا بەم قسەیە ناکات.

لە کۆتاییدا کاتێك زۆمبیەکان شوێنیان دەزانن، (رۆبێرت) داوا لە (ئانا و ئیزەن) دەکات بچن بۆ تاقیگە پزیشکیەکەی، لەوێدا ئەو زۆمبیە دەبینێت کە تاقیکردنەوەی لەسەری کردووە، دەبینێت کە دەرمانەکەی سەرکەوتوو بووە و زۆمبیەکە بووەتەوە بە مرۆڤ، لەوێدا نموونەیەك لە خوێنی ئەو چارەسەربووە دەدات بە (ئانا ) و داوای لێدەکات بڕوات و بچێت بۆ ئەو شوێنەی کە سەلامەتە(مەبەستی ئەو کۆمەڵگە بچوکەیە کە رزگاربووەکانی لێیە) . (رۆبێرت) لەوێدا خۆی دەکاتە قوربانی بۆ رزگاربوونی ئەوان.

نووسینەوەی چیرۆکی فیلمەکە بۆ ئەوەیە زیاتر لەو بابەتانە تێبگەین کە لە دوایدا باسی دەکەین، بۆ ئەوەشە کە ئەگەر خوێنەرێك پێشتر سەیری فیلمەکەی کردبێ و لێی تێنەگەیشتبێت.

جیاوازی ئەم فیلمە لەگەڵ فیلمەکانی تر دەربارەی ژیان دوای وێرانبوونی جیهان (Post-Apocalypse)، ئەوەیە کە لە زۆربەی فیلمەکانی تر ژیانی دوای وێرانبوونی جیهان کۆمەڵە مرۆڤێك تێیدا دەژین یاخود کۆمەڵێك خەڵك کە لە کاتی وێرانبوونی جیهان رزگاریان بووە بۆ نموونە ئەگەر وێرانبوونەکە بەهۆی زۆمبیەوە بێت وەك لە فیلمی ( World War Z) ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لێرەدا تەواو جیاوازە، ڕاستە لە خودی فیلمەکە جگە لە (رۆبێرت) خەڵکی تر لە ژیاندا ماون، بەڵام بە چاوی ئەو هیچ کەسێك نەماوە تەنها خۆی و سەگەکەی نەبێت، ئەوەش تەنها ڕۆژێك و دووان نییە، مانگێك و دوو مانگ نیە، بەڵکو چەندین ساڵە لەو تەنهاییەدا دەژی. تا لە کۆتاییەکەیدا بە چەند کەسێکیتر شاد دەبێت و بۆی دەردەکەوێت کە ئەو تەنها نییە لەم جیهانە. ئێمەش خوێندنەوەکە لە چاوی ئەوەوە دەکەین.

باسەکە لێرەدا ژیانێکی تەنهاییە لە جیهانی دوای وێرانبوونی زەوی(Post-Apocalypse)، ئەوەش ئەم فیلمە لە فیلمەکانی تر جیا دەکاتەوە.

# "تەنهایی لە جیهانێکی دوور لە مرۆڤ"

تا ئێستا بیرت لەوە کردۆتەوە لە جیهانێکدا بژی مرۆڤی لێنەبێت؟ یاخود دڵنیاییت بێت لەوەی کە هەرگیز دووبارە مرۆڤێك نابینیتەوە لە سەر زەوی؟ ئەگەر ئەوە ڕوویدات، ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە ژیانت چۆن دەبێت؟ یاخود چ شتێك دەکەی بە هاوڕێت کاتێك هیچ مرۆڤێك بوونی نەماوە؟

(ڕۆبێرت) ئەزموونێکمان لەم جۆرە ژیانە لە فیلمی ( I am Legend) پیشان دەدات. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام لەم فیلمەدا تەنهایی بوونی (ڕۆبێرت)ە و خۆگونجاندنیەتی لە ژینگەیەکی بێ مرۆڤ، لە کۆمەڵگایەکی تاکەکەسی. چونکە زۆر ئەستەمە بۆ مرۆڤ بتوانێت بە تەنیا بژێت، چونکە ئەوە دژبوونی مرۆڤە بە سروشتی خۆی. مرۆڤ لە سروشتیدا بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، ناتوانێت بژێت ئەگەر پەیوەندی بە مرۆڤی ترەوە نەبێت، چونکە بە پچرانی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤی تر، زۆر سروشتی تر لە دەستدەدات لەخۆیدا. لەوانە قسەکردن، سێکسکردن، سۆز و خۆشەویستی و هەستەکانی تر کە مرۆڤ بۆ مرۆڤی تر هەیەتی....هتد. بۆیە ئەستەمە مرۆڤ بە تەنیا بژێت و دەستبەرداری دەیان سروشتی خۆی بێت.

چی وا لە مرۆڤێك دەكات لەم جۆرە ژیانەدا بەردەوام بێت، یاخود چ هۆكارێك هەیە وای لێبكات ژیانی ڕۆژانەی بەبێ سروشتیی بەسەر ببات؟ (ڕۆبێرت) هۆكارێكی دۆزیوەتەوە، هۆكارەكە تاكە هاوڕێیەتی، هۆكارەكە بریتییە لە سەگێك. ڕاستە ئاژەڵ زۆر لە سروشتی مرۆڤیدا تێدا نیە، بەڵام دەتوانێت تەنهایی مرۆڤ بە ڕێژەیەكی یەكجار زۆر، كەم بكاتەوە. (ڕۆبێرت) لە فیلمەكە قسەی لەگەڵدا دەكات، پرسیاری لێدەكات، لەگەڵی پێدەكەنێت و دەیشوات، ئەوانە گشتی هۆكارن بۆ كەمكردنەوەی تەنهاییەكەی (ڕۆبێرت)، بۆیەش ئەو ئەگەرچی تەنهایە، كەسێكی تری لەگەڵدایە كە ژیانی ڕۆژانەی لەگەڵ دابەش دەكات و لێی توڕەدەبێت و قسەی پێدەڵێت و ئاشتدەبێتەوە لەگەڵی و گفتوگۆی لەگەڵ دەكات، ئەوەش تا ڕادەیەكی زۆر سروشتی مرۆڤانەی (ڕۆبێرت) دابین دەكات. بەڵام هێشتا وەك ئەوە نیە كە لەگەڵ مرۆڤێك بێت. جگە لەوەش (ڕۆبێرت) هێشتا ئومێدێكی بۆخۆی بەجێهێشتووە كە بەهۆیەوە بەردەوام دەبێت لەم ژیانە، ئەویش ئەوەیە كە ڕۆژێك دێت مرۆڤێك لە شوێنێكی ئەم دونیایە بێتە دەرەوە و پێی بڵێت منیش ماوم، منیش لە ژیاندام.

جگە لەوەی (ڕۆبێرت) هاوڕێیەكی هەیە كە سەگەكەیەتی، ئەو خۆی ڕاهێناوە لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەش، بۆ نموونە ڕۆژانە سەردانی شەقامەكان دەكات و هەندێ جار لەگەڵ سەگەكەی ئاژەڵی تر ڕاو دەكەن، زۆر جاریش

سەردانی مارکێتەکان دەکات بۆ شت کڕین و فیلم هێنان بۆ سەیرکردنی لە شەودا. (بێگومان لەم مارکێتانە کەسی تێدا نەماوە، بۆیە دەڵێین کڕین، چونکە (ڕۆبێرت) وا پیشان دەدات کە دەیکڕێت ئەوەش وای لێدەکات ئارام بێتەوە و کەمێك رابێت لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانەی و کەمتر هەست بە تەنهایی بکات). یان هەندێجار دەچێت بۆ فرۆکەخانە و یاری گۆڵف لەسەر باڵی فرۆکەکان دەکات، یاخود شتانێك کە پێشتر نەیدەتوانی بیکات. ئەوانە ڕۆژانەی (ڕۆبێرت) پێك دەهێنن.

کارێکی تر کە (ڕۆبێرت) کردویەتی لە فیلمەکە بریتییە لە دانانی چەند پەیکەرێکی جل نمایشکردن (وەك ئەوانەی لە بازار هەن) لە مارکێتەکە، گشتی جلوبەرگی لەبەر کردوون و لە شوێنی جیاواز جیاوازی مارکێتەکە دایناون، بۆ ئەوەی وا پیشان بدات کە ئەوانەش مرۆڤن بەلاّم قسە ناکەن، بۆیە زۆرجار کە شتێك دەکرێت دەچێتە لای کاشێری مارکێتەکە و پێی دەڵێت: هێی چۆنی؟، ئەو کچەم لە ریزی دووەم بینی، دەیناسیت؟ کێیە؟. بەو جۆرە گفتوگۆیە وا لەخۆی دەکات کەمێك هەست بە ئاسایی بوون بکات. هەرچەندە کاشێرەکە وەڵام ناداتەوە (بێگومان چونکە تەنها پەیکەرێکی جل نمایشکردنە) بەلاّم ئەو بۆی گرنگ نیە و دەڕوات.

# "دیمەنێك لێوان لێو لە تراژیدیا"

(ڕۆبێرت) تاکە هاوڕێ و هۆکاری بەردەوامی ژیانەکەی تا کۆتایی ژیانی لەگەڵی نابێت، ئەوەش وەك لەسەرەوە و چیرۆکی فیلمەکە باسمان کرد بەهۆی توشبوونی سەگەکەیەتی بە ڤایرۆسەکە لە دیمەنێکی فیلمەکە، کاتێك زۆمبییەکان تەڵەیەکیان بۆ داناوەتەوە بۆ تۆڵەکردنەوەی لێی چونکە (ڕۆبێرت) زۆمبیەکی بردبوو بۆ تاقیکردنەوە لەسەری. بەهەرحاڵ زۆمبیەکان وادەکەن کە سەگەکەی توشی ئەو ڤایرۆسە ببێت، بەڵام (ڕۆبێرت) ڕزگاری دەبێت، کاتێك سەگەکەی دەباتەوەماڵەوە، نازانێت چیبکات، چونکە تازە بەهۆی ئەو ڤایرۆسەوە ئەویش دەبێت بە زۆمبی، بۆیە بە ناچاری سەگەکەی لە باوەشی دەگرێت تا ئەو کاتەی دەزانێت بە تەواوی بووە بە زۆمبی، دەستەکانی بە هێزەوە لە ملی سەگەکەی دەنێت، تا دەیخنکێنێت. چ ئازارێکی هەیە کاتێك تاکە هاوڕێت لە ژیاندا بە دەستەکانی خۆت بیکوژی. (ڕۆبێرت) دوای ئەو کارەی گریانێکی بە خور دەگری، توشی کاردانەوەیەکی دەروونی بەرز دەبێت، بێگومان دەبێت وای لێبێت، چونکە ئیتر هیچ مانایەك بۆ ژیانی ئەو نەماوە، چیتر نازانێت بە چ هۆکارێك لە ژیاندا بەردەوامبێت، نازانێت چیبکات. وەك بڵێی بەدوای موعجیزەیەك یاخود شتێك بگەڕێت کە لە دواین کاتەکانی کۆتایی، ئومێدێکی پێ ببەخشێت.

(دیمەنەکە لێرە دەست پێدەکات)، (رۆبێرت) دەچێتەوە بۆ ئەو سوپەرمارکێتەی کە ڕۆژانە دەچوو و پەیکەرەکانی لێدانابوو، دەچێتە ژوورەوە و بە قاچێکی شەلەوە دەڕوات بۆ لای ئەو کچەی کە لە کاشێرەکەی پرسیبوو ناوی چییە و وەڵامی نەدابویەوە. دەچێت لە تەنیشتیەوە دەوەستێت، ڕوو لە زەوی دەکات و پێی دەڵێت: ئەمرۆ هاوڕێکەم لە دەستدا .. دامنابوو ئەمرۆ بێم و سڵاوت لێبکەم... سڵاو (بە گریانەوە) تکایە سڵاوم لێبکەرەوە ... تکایە سڵاوم لێبکەرەوە .... (رۆبێرت) ئەوەندە بێئومێد بووە لە ژیان کە تەنانەت چاوەڕێی پەیکەرێکە وەڵامی بداتەوە. تەنهایی کاتێك دەگاتە ئەو ڕادەیەی مرۆڤ هیچ شتێك نەدۆزێتەوە پەنای بۆ ببات، کەسێك شك نابات بۆ ئەوەی تەنانەت سڵاوێکی لێبکە.

چ هۆکارێك هەیە وا لە مرۆڤێك بکات بە تەواوی هۆشیارییەوە داوا لە پەیکەرێك بکات کە سڵاوی لێبکات. ئەو تراژیدیایە دیمەنی دوایین مرۆڤی سەر زەویە. کاتێك مرۆڤ هیچ شتێکی بۆ نامێنێتەوە بۆی بژی یاخود کاتێك دوایین کەسی مابێت لە ژیاندا و بە دەستەکانی خۆی بیکوژێت لەبەر ئەوەی ئیتر ناچارە، دەبێت چ ئازارێك لەوە گەورەتر هەبێت. زۆر جار گوێمان لێدەبێت خەڵکانێك لەبەر کۆچی دوایی کەسە نزیکەکانیان خۆیان دەکوژن، یاخود لەبەر مردنی خۆشەویستەکانیان، لە کاتێکدا دەوروبەریان هەمووی مرۆڤە و دەتوانن دووبارە دەست بە ژیان بکەنەوە. بۆیە ئەو حاڵەتەی

(رۆبێرت) تێیدایە، زۆر نارەحەتتر و هەست بزوێنترە، وا لە مرۆڤ دەکات ئەقڵی لە دەست بدات، وا لە مرۆڤ دەکات پەنا بۆ خۆکوشتن و شتی تر ببات، وا لە مرۆڤ دەکات توشی کاردانەوەی زۆر قورستر بێت، بۆیەش وای لە (رۆبێرت) کرد دواین ئومێدی لەسەر کچە پەیکەرێك تاقی بکاتەوە و هەوڵی گفتوگۆکردن بدات لەگەڵی. ئەوە تێکچوونێکی تەواوی دەروونی ئەو کەسە پیشان دەدات. بۆیەش هەر دوای ئەوەی کە دەزانێت ئیتر چارەی تری نیە و خۆکوشتن باشترین هەڵبژاردنە بۆی، (رۆبێرت) هەوڵی تۆڵەکردنەوەی سەگەکەی دەدات و باشیش دەزانێت کە بە مردنی کۆتایی پێدێت. بەڵام لەم نێوەندەدا وەك لە چیرۆکی فیلمەکە لەسەرەوە باسمان کرد، کچێك دەبێتە هۆی رزگارکردنی لە دەست زۆمبیەکان، بەڵام تەنانەت دوای بەهۆش هاتنەوەشی لە ماڵی کچەکە، هێشتا کاریگەری ئەو تێکچوونەی لەسەر ماوە و داوا دەکات کەمێك کاتی بدەنێ بۆ ئەوەی بێتەوە سەرخۆی.

ڕەنگە بە خوێندنەوەی ئەو چەند دێرەی سەرەوە وەك سەیر کردنی فیلمەکە کاریگەری لەسەرتان نەبێت، بۆیە پێشنیار دەکەم سەیری بکەن.

# "تەنهاییەکی ناچاری: بەراوردێك لە نێوان فیلمی (I am Legend) و (Cast Away)"

ڕەنگە زۆرێکتان فیلمی (Cast Away)یتان بینیبێت، بۆ ئەوانەی نەشیان بینیوە، با من پێتان بڵێم. (Cast Away) باس لە پیاوێك دەکات بە ناوی (چاك نۆلاند) کە ئەکتەری ئەمریکی بەناوبانگ (تۆم هانکس) ڕۆڵەکەی گێڕاوە. لەم فیلمەیدا کە ناوی (Cast Away)یە، بەهۆی تێکشکانی فڕۆکەیەکی گەشتیارییەوە لە نێوەندی دەریادا دەکەوێتە دوورگەیەك، دورگەیەك کە نە کەسی پێگەیشتووە، نە کەشتی و فڕۆکەیەکیش دەیبینێت. بۆیە تەنها خۆی دەمێنێتەوە تێیدا.

(چاك نۆلاند) هەوڵی پەیاکردنی خواردن دەدات بە گرتنی ماسی و خواردنی زیندەوەری بچوك تا خواردنی گوێزی هیندی، بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت لەوێدا. دوای ئەوە هەوڵی ئاگر کردنەوە دەدات و لەوەش سەرکەوتوو دەبێت، پاش ئەوەش هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەك دەدات بۆ ئەوەی بە شێوەیەك بتوانێت لەم دورگەیە رزگاری بێت، بەلاّم هەمووی بێ هودەیە. دوای تێپەڕینی چەند هەفتەیەك لە دورگەکە، (چاك) جۆرێك لە نا ئومێدی دەیگرێت و دەزانێت کە ئیتر لێرە ناتوانێت دەربازی بێت، پەنا بۆ

ئەو هۆکارانە دەبات کە وای لێدەکات بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێ بمێنێتەوە. لەوانە : شوێنێك بۆ خۆپاراست ن لە کاتی باران بارین، پەیاکردنی هەندێ سەرچاوەی خواردن، دارێکی درێژ بۆ راوکردنی ماسی، (تۆپێکی نەخشێندراو).

دوای مانەوەی نزیکەی ٤ ساڵ لەو دورگەیە، (چاك) بڕیاری جێهێشتنی دەدات بەهۆی بەلەمێکەوە، دوای بڕینی ماوەیەکی زۆر و نەمانی ئاو لای و تێنوو بونێکی زۆر دەتوانێت لە کۆتایدا بگاتەوە بە وشکانی. لەوێ دوای ئەو ماوەیەی لەو دورگەیە ماوەتەوە زۆر شت گۆڕاوە، لەوانە خۆشەویستەکەی شوی کردووە، ئەوەش زۆر دڵتەنگی دەکات. بەڵام ئەو هەر لە ژیاندا بەردەوام دەبێت.

ئەوەی من مەبەستمە قسەی لەسەر بکەم، ئەو تۆپە نەخشێندراوەیە، خاڵە گرنگەکە لەوەدایە. (چاك) دەزانێت کە ماوەکەیەکی زۆری پێدەچێت لەو دورگەیە، بەڵکو ڕەنگە هەر نەتوانێت بگەڕێتەوە و تا تەواوی ژیانی لەم دورگەیە بێت، بۆیە دەزانێت کە ناتوانێت تەنیا بژێت بێ ئەوەی هاوڕێیەکی هەبێت، بڕیار دەدات شێوەی دەمووچاوێك لەسەر تۆپێك دروست بکات کە لەگەڵ هەندێك لە کەلوپەلەکانی فڕۆکەکە کەوتبویە خوارەوە. بە دەستی خوێناوی نیشانەیەك لەسەر تۆپەکە دروست دەکات و

چاو و دەمیشی بۆ دروست دەکات، لەگەڵ قژی بەهۆی پەلکی ڕووەکەوە. ئیتر ناوی دەنێت (ویڵسن) و ڕۆژانە قسەی لەگەڵ دەکات، دوای چوار ساڵ مانەوەی لەسەر ئەم دورگەیە، (ویڵسن) تاکە هاوڕێی دەبێت، دوای ئەو چوار ساڵە گفتوگۆی نێوانیان زۆر ئاسان دەبێت، هەرچەندە تۆپەکە قسە ناکات و شتێکی بێ گیانە، بەلام (چاك) خۆی وەلامەکانی دروست دەکات و جۆرێك لە گفتوگۆ دروست دەکات.

خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئەم دوو فیلمە ((I am Legend) و (Cast Away) ) بریتییە لەوەی هەردوکیان ئومێدیان بەوە نەمابوو کە دووبارە مرۆڤێك دەبیننەوە، هەردووکیان جگە لە مرۆڤ شتێکیان هەڵبژاردبوو وەك هاوڕێ، هەردووکیشیان خواردنی ڕۆژانەیان هەبوو و شوێنێکیان هەبوو تێیدا پشوبدەن، هەردووکیان زۆر جار بێزاردەبون و هەستیان بە تەنهاییەکی زۆر دەکرد.

جیاوازی لە نێوان (رۆبێرت) لە فیلمی (I am Legend) و (چاك) لە فیلمی (Cast Away)، بریتییە لەوەی کە (چاك) لە دورگەیەك بوو توانای دۆزینەوەی هیچ شتێکی نەبوو کە بتوانێت قسەی لەگەڵدا بکات یاخود هیچ نەبێت گوێی لە شتێك بێت قسە بکات، بەلام (رۆبێرت) لە شارێکی فراوان دەژیا، شەوانە دەیتوانی سەیری فیلم بکات و کێشەی نەبوو. ئەوەی جیاواز بوو لە نێوانیاندا، (چاك) دەیزانی کە ئەگەر

بێتوو بۆ ماوەیەکی زۆر لەو دوورگەیە بمێنێتەوە، ئەوە زمانەکەی بیردەچێتەوە و ڕەنگە بەرەو بیرکردنەوە و خەیاڵی سەیری ببات کە لە کۆتایدا بەرەو شێت بوونی ببات، بەڵام (رۆبێرت) ئەو کێشەیەی نەبوو. (چاك) پەنای بۆ دروستکردنی هاوڕێیەك برد، کاتێك بینی هیچی دەستناکەوێت، شتێکی بێ گیانی کرد بە هاوڕێی بۆ ئەوەی تەنیا نەبێت، ئەویش تۆپێك بوو. بەڵام (رۆبێرت) لەبەر ئەوەی سەگەکەی هەر لەگەڵدا بوو، ئەم هەڵەی قۆستبۆوە و وەك هاوڕێیەکی نزیکی وابوو، ئەو گیانلەبەرێکی کردبوو بە هاوڕێی. بەڵام ئامانجی هەردووکیان تەنهایی نەبوون بوو. ئەم ژیانە بە تەنهایی ناچێتە سەر.

لە دیمەنێکدا، (چاك) بەهۆی توڕەبوونی، تۆپە دەموچاوەکە(وێڵسن) فڕێ دەداتە نێو دەریا، بەڵام هەرزوو پەشیمان دەبێتەوە و دەچێت دەیهێنێتەوە و زۆر داوای لێبوردنی لێدەکات، تا ڕادەیەك ئەو دیمەنە لەگەڵ دیمەنی مارکێتەکەی فیلمی ( I am Legend) نزیکە، چونکە لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان دەزانن ئەوەی کە قسەی لەگەڵ دەکەن شتێکی بێ گیانە، بەڵام وا پیشان دەدەن کە ئەوانیش قسەی خۆیان هەیە و ئەوان گرنگن بۆ بەردەوامبوون لە ژیاندا. جگە لەوەش لە دەستدانی هەر یەکێك لەو هاوڕێیانە(سەگەکە و تۆپە دەموچاوەکە) هۆکار دەبێت بۆ بێ هیوابوونێکی تەواو لە ژیاندا، بۆیە (چاك)

هەر زوو دەچێت دەیهێنێتەوە. (رۆبێرت)یش دوای مردنی سەگەکەی ئەو هیوای هەیەتی بە ژیان لە دەستی دەدات، ئەگەر ئەو کچە نەیدۆزیبوایەتەوە و ڕزگاری نەکردایە ئەوە یان دەمرد یان توشی شێتییەکی یەکجاری دەبوو.

مەبەست لێرە پیشاندانی مەترسی تەنهایی بوونی مرۆڤە، کە ئایا ئەگەر بێتوو مرۆڤ لە تەنهاییدا بژێت ژیانی چۆن دەبێت، بێگومان پەنا بۆ شتێك دەبات کە بیکات بە هاوڕێی، تەنانەت ئەگەر ئەو شتە ئاژەڵ بێت یاخود شتێکی بێ گیان. لە کۆندا وا باوبوو زۆرێك لە خەڵکی ئەستێرەیەکیان دیاریدەکرد و دەیانکرد بە هاوڕێی خۆیان، لە شەواندا قسەیان بۆ دەکرد و ئەوەی لە دڵیاندابووایە بۆیان باس دەکرد، وەك ئەوەی کە ئەستێرەکە گوێی لێبێت و وەڵامی بداتەوە. بەڕاستی سروشتی مرۆڤ بابەتێکی ئاڵۆزە.

مرۆڤ بە تەنها بوون زۆرێك لە سروشتەکانی لە دەست دەدات، تەنانەت زۆرجار دەبێتە هۆی لە دەستدانی عەقڵیش وەك پێشتر باسمان کرد، بۆیە تێکەڵاوبوونی خەڵکی تەندروستیەکی دەروونی بە مرۆڤ دەبەخشێت، ئەوانەی زۆر لەگەڵ خەڵکی و دەوروبەریان نزیکن، بە ڕێژەیەکی زۆر کەمتر توشی نەخۆشی دەروونی دەبن لەگەڵ ئەوانەی کە گۆشەگیر و تەنهان .

### خاڵی سێیەم:

## "مرۆڤ خواردن(cannibalism) : سەرهەڵدانی لە جیهان دوای وێرانبوونی(Post-Apocalypse)"

یەکێك لە دیاردە سەیرەکان کە لە جیهان دوای وێرانبوونی (Post-Apocalypse) پەیدا دەبێت، بریتییە لە پەیدابوونی مرۆڤخۆرەکان، ئەوانەی کە لەسەر گۆشتی مرۆڤ ڕادێن و تەنها مرۆڤ دەخۆن، ئەو جۆرە مرۆڤانەش لە چەند فیلمێکی (Post-Apocalypse) ئاماژەی پێکراوە. وەك لە فیلمی (The book of Eli) و فیلمی (The Colony) مرۆڤ خواردن دیاردەیەکە.

مرۆڤخواردن مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدان ساڵ بەر لە ئێستا، کەسانێك هەن لەسەر گۆشتی مرۆڤ ڕاهاتوون، جا ئەوەش چەند هۆکارێکی هەیە و لە خۆڕا نیە. ئەوانەی کە مرۆڤخۆرن خوی پێوەدەگرن و ناتوانن وازی لێبێنن.[٢٢] یاخود لە ڕووی عەقڵیەوە تەواو نین، یاخود وەك جۆرێك لە نەریتێکی کۆن ماوەتەوە لای چەند هۆزێك، هەرچۆنێك بێت لە جیهان دوای وێرانبوونی بۆ دوو هۆکار دابەشی دەکەین.

١- بەهۆی برسیەتی: ئەوە هۆکاری سەرەکییە. زۆرێك لە مرۆڤەکان بەهۆی برسیەتیەوە توشی ئەم حاڵەتە دەبن، بەڵام پێش برسیەتیش هۆکارێکی تر هەیە کە وایان لێدەکات پەنا بۆ خواردنی گۆشتی مرۆڤ ببەن. ئەویش لە دەستدانی مۆراڵی(ئەخلاقی) مرۆڤ بوونە، لێرەدا دەتوانین نموونە بە فیلمی (Snowpiercer) بهێنینەوە. ئەم فیلمە یەکێکە لەم فیلمە گرنگ و بەهێزانەی تا ئێستا دەربارەی ژیانی مرۆڤ لەدوای وێرانبوونی زەویدا دەرهێنراون، تێیدا باس لەوە دەکات کە چۆن لە داهاتوویەکی دووردا زەوی بەهۆی گۆڕانی کەش و هەواو و نزمبوونەوەیەکی یەکجاری پلەی گەرمی بەرەو بەستبوون چووە و تەواوی مرۆڤایەتی تەنها لە شەمەندەفەرێکدا ماوەتەوە. ئەم شەمەندەفەرە وێنای تەواوی ژیانی مرۆڤ دەکات، هەندێك تێیدا وەك پاشا دەژین و لە هیچ شتێکیان کەم نییە، لە بەرامبەردا کۆمەڵێك هەن کە لە پاشکۆی شەمەندەفەرەکەدا ژیان بەسەر دەبەن و زۆر برسین. بەگوێرەی وتەکانی کاراکتەری سەرەکی فیلمەکە، ئەو خەڵکەی لە پاشکۆی شەمەندەفەرکەدا ژیاون، چەندین کەسیان لە برسیەتیدا مردوون، تا وایان لێهاتووە کۆمەڵێکیان دەستیان کردووە بە کوشتن و خواردنی گۆشتی ئەوانەی لاوازبوون تێیاندا. بە تایبەت منداڵەکان، ئا لێرەدا کارێکی ئەخلاقی ئەم نا ئەخلاقییە ی کۆمەڵە مرۆڤەکە ڕاست دەکاتەوە، کاتێك یەکێکیان

دەیەوێت پەلاماری منداڵێك بدات و بیکوژێت، پیرەپیاوێك قاچی خۆی دەبڕێتەوە و دەیدات پێی تا واز لە منداڵەکە بێنێت، بەوەش مرۆڤەکە دێتەوە هۆش خۆی و دەزانێت چەندە هەڵە بووە. مرۆڤ زۆر گەورەترە لەوەی پەنا بۆ خواردنی مرۆڤ ببات، مەگەر هۆکارێك هەبێت کە ئەو مرۆڤبوونەی لێ بسێنێتەوە. زۆر جار گوێمان لێبووە کەسانێك بەهۆی گەشتێکی دور و درێژەوە خواردنیان دەست نەکەوتووە بۆیە پەنایان بۆ خواردنی هەر شتێك بردووە کە لایان بووە، بۆ نموونە خواردنی ئەسپ و گوێدرێژ، یان حوشتر. بەلاّم زۆر بە کەمی گوێمان لێدەبێت کە مرۆڤ بەهۆی برسیەتی مرۆڤ بخوات. وەك چۆن گوێشمان لێبووە کە کۆمەڵە مرۆڤێك لە دورگەیەك یاخو ڕێگایەکی بیابانی، لە برسیەتیدا مردون، بەلاّم پەنایان بۆ یەکتر خواردن نەبردووە، بێگومان چیرۆکی واشمان زۆرە کە کەشتیوانەکان بۆ نموونە، لە کاتی گەشتێکی دورو درێژدا پەنایان بۆ خواردنی گۆشتی مرۆڤ بردووە.

لە فیلمی (The Colony) کە بەهۆی تێکچوونی کەش و هەوا و بەفربارینێکی زۆر دونیا گشتی داپۆشراوە بە بەفر، ئەوانەی لە ژیاندا ماون لە چەند کۆمەڵگەیەك دەژین کە بە شێوەیەك دروستکراوە لە ژێرزەویە و گەرمیەکی زۆری تێدایە بۆ پاراستنی مرۆڤەکان تێیدا. ئەو شوێنانە بە

(Colony) ناودەبرێن، لەم نێوەندەشدا دوو (Colony) هەیە کە یەکێکیان (Colony۷ )، ئەویتریان ( Colony ٥). کە هەردووکیان کۆمەڵە مرۆڤێکی تێدا دەژی، لە فیلمەکەدا ( Colony٥ ) پەیوەندی بە ئەوانیترەوە دەپچڕێت، بۆیە چەند کەسێك لە ( Colony۷ ) دەچن بۆ زانینی هۆکاری پەیوەندی پچڕانەکە، لەوێدا ڤیدیۆیەك دەبینن کە پەیامێکی کەسێکە لە شوێنێك کە خۆر و زەوی و ئاوی لێیە، داوا لە خەڵکانی تر دەکات کە تۆوی ڕووەك لەگەڵ خۆیان بێنن بۆ چاندنی و دەستکەوتنی خواردن(پەیامەکە کۆن دیارە). ئەوانیش شوێنەکە دەستنیشان دەکەن. بەڵام هێشتا دەیانەوێت بزانن چی لە ( Colony٥ ) ڕوویداوە، کەسێکی زیندوو دەبیننەوە و پێیان دەڵێت کە کۆمەڵێك لە ( Colony٥ ) ڕۆیشتن بەدوای ئەم پەیامە ڤیدیۆییە و لەگەڵ خۆیاندا "ئەوان"یان هێنا. زۆر لێی دەپرسن مەبەستت چییە لە "ئەوان" بەڵام لە ترسا وەڵام ناداتەوە. دواتر دەبینن کۆمەڵێك کەس لە شوێنێکدا دەستیان داوەتە خواردنی گۆشتی مرۆڤ. "ئەوان" مرۆڤخۆرەکان بوون. بەهۆی برسیەتی لەو شوێنە گەرمەی کە لێیبوون و داوای تۆوی ڕووەکیان دەکرد، پەنایان بردۆتە بەر خواردنی مرۆڤ و لە کۆمەڵە کەسەکەی ( Colony٥ ) دەستیان پێکردووە و شوێنەکەیان دۆزیوەتەوە و ڕۆشتوون بۆ ئەوێ.

هەرچۆنێك بێت، مەبەستی باسكردنی ئێمە لەوەدایە كە ئەو كۆمەڵە خەڵكەی لە شوێنێكی گەرم و هەبوونی ڕووناكی خۆر و خاك دەژیان، بەهۆی تێپەڕبوونی ماوەیەكی زۆر بەسەر ئەو پەیامە و نەگەیشتنی هیچ كەسێك بۆ لایان، برسیەتییەكی زۆر ڕووی تێكردوون كە بووەتە هۆی دەستكردن بە خواردنی گۆشتی مرۆڤ، ئەوەی دەشیانەوێت بریتییە لە مرۆڤی زیاترچونكە وەك دیارە مرۆڤخۆرەكان خو دەگرن بە خواردنی گۆشتی مرۆڤ. ئەوەی جێگای تێبینیە لەم فیلمەدا بریتییە لەو دڕندەییەی مرۆڤخۆرەكان، كە هیچ شتێكی تر نازانن جگە لە خواردنی مرۆڤ، لێرەوەش دەتوانین بڵێین مرۆڤەكان پێش ئەوەی برسییەتی ڕێگایان بدات پەنا ببەنە بەر گۆشتی مرۆڤ، ئەوا سەرەتا نەمانی ویژدان و ئەخلاقیی مرۆڤبوون ڕێگایان دەدات ئەو كارە بكەن. برسییەتی دەبێتە هۆی لە دەستدانی مۆراڵی مرۆڤبوونیشی، بە شێوەیەك كە تەنها شتێك بۆی گرنگ بێت نەهێشتنی ئەو برسییەتیەیە، جا ئامادەیە لەم پێناوەدا دەست بۆ خواردنی هەمووشتێك ببات.

پێموایە بەهێزی باوەڕ و مۆراڵی مرۆڤ ڕێگرە لە دروستبوونی شتێكی لەم جۆرە، ڕەنگە زۆرێك بپرسن چۆن برسییەتی وادەكات مرۆڤ كارێكی وا قێزەون بكات، بەڵام ئەوانەی كە دەپرسن ئایا تەنها بۆ ٣ ڕۆژ برسییەتییان دیوە؟ بێگومان نەخێر، ئەی چی دەربارەی ئەوانەی بە حەفتە برسییان بووە و هیچ شتێك نەبووە بیخۆن، یان ئەوانەی ناچاربوون گۆشتی

ئەسپ و سەگ بخۆن لە ڕێگادا؟ بۆیە برسییەتی وا لە مرۆڤ دەکات پەنا بۆ زۆر کاری قێزەونی لەم جۆرە ببات.

٢- بەهۆی دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە کۆمەڵگا: وەك ئەوەی لە ریکۆردەکان هەیە، ئەو کەسانەی کە تاوانی مرۆڤخواردنیان ئەنجام داوە، بریتیبوون لەوانەی کە لە شوێنێکی دوور لە کۆمەڵگا ژیاون، ئەوانەی ڕۆژانە هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵ مرۆڤ نەکردووە، بۆیە هەم کاریگەری دەروونی و هەم برسییەتی وای لێکردوون ئەو کارە بکەن.

دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگا مرۆڤ لە زۆر شتدا بێ بەش دەکات، بۆ نموونە : ئاگەداری نوێگەریەکانی کۆمەڵگا نابێت، لە کلتوری کۆمەڵگاکەی دووردەکەوێتەوە، تا ڕادەیەك بیر و هۆشی نامێنێت، کار لەلایەنی هەست و سۆزی دەکات، شێوازی هەڵسوکەوتی کۆمەڵگا نازانێت. ئەوانە گشتی ئەنجامی دوورکەوتنەوەی مرۆڤن لە کۆمەڵگا، گرنگترین شتیش بریتییە لە لەدەستدانی مۆڕاڵی مرۆڤبوون و گۆڕانی مرۆڤ بۆ بوونەوەرێکی دڕندە. لە فیلمی (The book of Eli) ، مرۆڤخۆرەکان لەگەڵ مرۆڤەکان دەژین، بەڵام بەهۆی چەند هێمایەك جودا دەکرێنەوە لەگەڵ مرۆڤەکان، بۆ نموونە ئەگەر دەستیان لەرزێکی زۆری لێببێت یاخود لێویان وشك بوبێت. لە دیمەنێکدا پیاوێك کاتێك بۆ یەکەمجار دەچێتە بارێك، سەرەتا پێی دەڵێن کە دەستەکانی بێنێتە پێش بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی کە مرۆڤخۆر نیە. واتە

به جۆرێك له جیهان دوای وێرانبوونی (Post-Apocalypse) مرۆڤخۆرەكان زۆربوون تا ئەو ڕادەیەی ببێت به دیاردە و بچی بۆ هەر شوێنێك سەرەتا بتپشكنن و دڵنیا بن لەوەی كه تۆ یەكێك نیت لەوان، ئەوەش له فیلمی (The book of Eli) به ڕوونی دەبینین. یاخود له دیمەنێكی تردا كاتێك كاراكتەری سەرەكی فیلمەكە لەگەڵ كچێكدا ڕوودەكەنه خانوێك، ئافرەت و پیاوێكی پیری تێدا دەژی، دوای كەمێك گفتوگۆ و بەخێرهاتن، بۆیان دەردەكەوێت كه ئەوانه مرۆڤخۆرن و ئەگەر زوو ئەو خانوه جێنەهێڵن دوورنیه ببن به خواردنی ئەوان.

مرۆڤخۆرەكان، نه زۆمبین، نه خوێنمژەكانن، نه دڕندەشن، بەڵكو تەنها مرۆڤن به هۆی برسییەتی و دووری له كۆمەڵگا و له دەستدانی مۆڕاڵی(ئەخلاقی) مرۆڤبوون پەنا بۆ خواردنی گۆشتی مرۆڤ دەبەن و بەم شێوەیه خوی پێوه دەگرن.

## خاڵی چوارەم:

## "لە دایك بوونەوەی باوەڕ"

یەکێکیتر لە خاڵە گرنگەکانی جیهان دوای وێرانبوونی (-Post Apocalypse)، بریتییە لە نەمانی باوەڕ(ئیمان) لە نێو خەڵکیدا و پێویست بوونی باوەڕ لە نێویاندا. بێنە پێش چاوت ئەم جیهانە کاتێك بەرەو وێرانبوون ڕۆشتووە و شتێك نەماوە بە ناوی دین و باوەڕبوون بە خودا لای مرۆڤەکان، دەبێت حاڵی مرۆڤەکان چۆن بێت؟ یاخود تا ئێستا بیرت لە جیهانێك کردۆتەوە کاتێك مرۆڤەکان هیچ دینێکیان نیە و شتێك ناناسن بە ناوی خودا؟

لە کاتی وێرانبوونی جیهان(Apocalyptic) جا بە هەر هۆکارێك بێت وەك لە بابەتەکانی پێشوتر باسمان کرد، خاڵێکی هاوبەش هەیە لە نێوان هەموو فیلمەکان لە نێو خەڵکیدا، ئەو خاڵەش بریتییە لە نەمانی باوەڕ(ئیمان)، خەڵك بۆی ئاساییە هەمووشتێك بکات کە پێشتر بەهۆی باوەڕکەیەوە لێی قەدەغە کرابوو، وەك ئەوەی بڵێت ئەو باوەڕەی هەیبوو بۆ ژیانی ئێرە بوو، کاتێك هەمووشمان دەمرین ئیتر بۆچیمانە. لە فیلمی (Seeking a Friend for The End of The world)، کە

فیلمێکی سینەمایی کۆمیدیە، باسی ئەو کاتە دەکات کە مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت دەمرێت پەنا بۆ چی دەبات و چی دەکات، لە دیمەنێکدا دەبینین کاراکتەری سەرەکی فیلمەکە دەچێت بۆماڵی خوشکەکەی بۆ ئەوەی لە کۆتایی دونیادا خواحافیزی لێبکات، دەبینێت ئاهەنگێکی گەورە لە ماڵیان سازکراوە و تێیدا کاری ناشیاو دەکرێ، لە ناکاو خوشکەکەی ماچی دەکات، ئەو پێی دەڵێت چۆن شتێکی وا دەکەی کە من برای تۆم؟. ئەویش دەڵێت کێ ئیتر بۆی گرنگە، تازە جیهان بەرەو کۆتایی دەڕوات. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو بێ باوەڕیەی لە جیهان دوای وێرانبوونی (Post-Apocalypse)درووستدەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ کاتی وێرانبوونی زەوی بە هەر شێوەیەك بێت. مرۆڤ وا هەست دەکات کە ئیتر ئەو شتانەی لەم جیهانە باوەڕی پێیەتی بۆ پاراستنیەتی لەم جیهانە و کە مرد ئیتر کارێکی پێنامێنێت، هەڵبەتە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان بە ژیانێکی دوای مردن نیە، یاخود تا ئەو کاتەی دەژی کێشەیەکی لەگەڵ ئەم بابەتەدا نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێت کە ئیتر جیهان کۆتایی دێت، واز لە گشت ئەوانە دەهێنێت.

یاخود ئەگەر بێتوو نموونەیەکی تر لە فیلمی (The Divide) بهێنینەوە، ئەو فیلمەی هەردوو کاتی جیهان لە وێرانبوونی و دوای وێرانبوونی زەوی

نیشان دەدات، نموونەیەکی زۆر جوانی مرۆڤەکان نیشان دەدات لەو کاتانەدا، گۆڕانی سروشتی مرۆڤ و لە دەستدانی مۆراڵ و گۆڕانی مرۆڤ بۆ گیانەوەرێك.

لەو فیلمەدا تێکچوونی زەوی و لەناوچوونی (Apocalyptic)، بەهۆی جەنگەوەیە، جەنگێکی جیهانی، پێشتر وەك یەکێك لە هۆکارەکانی وێرانبوونی زەوی باسمان کرد. لە سەرەتای فیلمەکە وەك پیشان دەدات، کچێك وەستاوە لەبەردەم پەنجەرەیەك لە نێو باڵەخانەیەکدا لە شاری نیو یۆرکی ئەمریکی، دەبینێت لە بەردەمیدا بۆمبێکی ئەتۆمی دەتەقێتەوە، ئەو خەڵکەی لەوێن هەموو بۆ ژێرزەمینەکە ڕادەکەن. لەوێدا رزگاریان دەبێت و پارێزراو دەبن، دواتر بۆیان دەردەکەوێت کە ئەم ژێرزەمینە لە لایەن چەند کەسێکەوە ئامادەکراوە بۆ ئەو کاتە، بە شێوەیەك خواردن و گشت شتێکی لێدابین کراوە. بە تێپەڕینی کات، مرۆڤەکانی ئەوێ هەست بە ترس و بێزاربوون دەکەن لەم شوێنە. لەگەڵ زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی لەوێدا خۆیان شاردۆتەوە، بەڵام زۆرێکیان دەکوژرێن بە شێوەیەك کە لە کۆتایدا تەنها یەك کەس رزگاری دەبێت. وەك لە فیلمەکە پیشان دەدرێت، لە هەمان کاتدا کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە لە ژێرزەمینەکەن، خەڵکێکیتر لە دەرەوە شتێك لە جۆری کامپیان درووست کردووە بۆ تاقیکردنەوە، کەسیش تەنانەت لە

فیلمەکەش نازانێت کە ئەوانە کێن و ئەو تاقیکردنەوەیان بۆچییە. بە تایبەت کاتێك کە دێن بۆ ژێرزەمینەکە و منداڵێك دەبەن بۆ تاقیکردنەوە. بەڵام وەك دیارە ئەو کۆمەڵە کەسە سەر بەو لایەنەن کە بۆمبە ئەتۆمیەکەیان لەم شارە داوە.

ئەو ژێرزەمینە تاقیکردنەوەیەکی زۆر باش دەبێت بۆ ئەوەی بزانین سروشتی مرۆڤ چۆنە کاتێك دەزانێت کە دەمرێت و لەگەڵ ئەو کاتەی کە دەزانێت ئیتر لە جیهانێکە زۆرینەی مرۆڤایەتی کۆتایی پێهاتووە، ئەو تاقیکردنەوەیە بۆ زانینی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنی مرۆڤە لە بارودۆخێکی لەم شێوەیەدا. بۆیە ئەوەی دەبینین بەداخەوە لەم فیلمەدا، لەم ژێرزەمینەدا ئەوەی بەهای ئەخلاقی و پیرۆزی مرۆڤە لەناودەچێت، هەرچی کاری ناشیاو و دوور لە ڕەوشتە ئەنجام دەدرێت. ئەوەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کاتێك مرۆڤ باوەڕی لە دەست دەچێت دەگۆڕێت بۆ چ شتێك و چی لێ درووست دەبێت. بەڕاستی داماون ئەوانەی وادەزانن ئەو باوەڕەی هەیانە تەنها بۆ ئەو کاتەیە لە ژیاندان و ئیتر بە لەناوچوونی ئەو ژیانە ئامادەن ئەو باوەڕە لە دەست بدەن. جارێك لەگەڵ برادەرێك کە باوەڕی بە بوونی دین نەبوو، دینی ئیسلام. موناقەشەیەکی بچوك ڕوویدا لە نێوانمان، ئەو سەرەتا چەند خاڵێکی زۆر جوانی باسکرد، گوتی کەوا ئەگەر

دین نەمێنێت، ئەوا مرۆڤەکان دەتوانن خۆیان لە ژێر بنەمای مرۆڤبوون و ئەخلاق پارێزگاری لەیەك بکەن و یارمەتی یەکتر بدەن، یاخود دەیگوت دین تا ئێستا هەر تەنها هۆکار بووە بۆ تیرۆر و شەڕ، بە نەمانی، مرۆڤ لە ئەندێشەکردن پارێزراو دەبێت و ....هتد. پێم گوت بەڕاستی قسەکانت جوانن، بەلأم ئەلتەرناتیڤێکم(بەدیل) بدەرێ جگە لە دین و باوەڕ کە بتوانێت پارێزگاری لەو بنەما بەرزانە بکات کە باسی دەکەی، چونکە ئەوەتا هەر مرۆڤە دوای لە دەستدانی باوەڕی ئەو بنەمایانە دەشکێنێت، مرۆڤبوونی مرۆڤ شتێکی حەتمی نیە، مرۆڤ گەر باوەڕی نەبێت خۆی ناتوانێت پارێزگاری لە مرۆڤبوونی بکات.

مرۆڤ پێویستە ترسێکی لەسەر بێت بۆ ئەوەی ئەو بەها پیرۆز و گەورانەی لە مرۆڤایەتیدایە بیپارێزێت بە هۆیەوە، ئەو ترسەش مەگەر تەنها لە دیندا بدۆزرێتەوە. زۆر کەس هەیە لە ناخیدا حەز بە کردنی چەندین کاری دڕندەیی و ناشیاو و نامرۆڤانە دەکات، بەلأم بەهۆی ترس لە دین و جەهەننەم و ڕۆژی دوایی نایکات. مرۆڤی بێ باوەڕ گیاندارێکە کە ئەگەر لە پێناو کەسانی باوەڕداری دەوروبەری نەبوایە زۆر لای ئاساییبوو کامە کار ناشیاوە ئەنجامی بدات.

## "مرۆڤ پەرستن: سەرهەڵدان لە جیهانی دوای وێرانبوونی زەوی"

ئەم بابەتەمان پێشتریش لە بەشی یەکەم باسکردووە، بەڵام لێرەدا تەنها پێداچوونەوەیەکی بچوکی بۆ دەکەین. جگە لەوەی مرۆڤ باوەڕی لە دەستدەدات دوای وێرانبوونی زەوی، بەڵام وەك پێشتریش باسمان کردووە ئەو نەمانی باوەڕە بەندە لەسەر چۆنیەتی کۆتایی هاتنی زەوی. بە واتایەکی تر: لە هەندێك جۆری وێرانبوونی زەویدا مرۆڤ بە شێوەیەکی تر باوەڕی نامێنێت. بەڵام کاتی وێرانبوونی زەویش کار لەسەر ژیانی دوای وێرانبوونی زەویش دەکات، بۆ نموونە ئەگەر جیهان لە داهاتوویەکی دووردا وەك لە فیلمی (Cloud Atlas) ئاماژەی پێکراوە کۆتایی بێت، ئەوە جیهانی دوای ئەو وێرانبوونە زۆر جیاواز دەبێت ئەگەر بێتوو جیهان لە سەردەمێکی زوودا کۆتایی پێبێت.

لە دەستدانی باوەڕ، ڕەنگە بەهۆکاری جیا جیابێت، بە شێوەیەك لە فیلمی (Cloud Atlas)دا خەڵکی لە جیاتی خودا، مرۆڤێك دەپەرستن، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کەسانێك هەن کە بێ باوەڕن لەو کاتەدا. بۆیە دەتوانین بڵێین لە دەستدانی باوەڕ مەرج نیە تەنها بەهۆی بێ ئومێدبوونی مرۆڤ بێت لە ژیانی، بەڵکو بەهۆی بە هەڵە چوونی مرۆڤیشە لە

پەرستنی شتانێکی تر جگە لە خودا. ئەوەش بە تەواوی لەو فیلمەدا دەبینین.

لە کۆتاییەکەییدا کاتێك کەسێکیتر لە شوێنێکی ترەوە دێت و بە خەڵکەکە دەڵێت کە ئەوان بە هەڵەداچوون لە پەرستنی شتێك کە مرۆڤێکە وەك ئەوان، هەرچەندە ئەو وەلامە شتێکی قبوڵکراو نیە، بەلاّم بەهۆی چەند بەڵگەیەکەوە بڕوا دەکەن.

## "پێویستی گەڕانەوەی دین (باوەڕ) بۆ مرۆڤایەتی"

وەك پێشتر باسمان کرد، کە چۆن باوەڕ پارێزەری بەها گەورەکانی مرۆڤبوونە، ئاواش نەمانی، بریتییە لە نەمانی بەها بەرزەکان لەنێو مرۆڤەکاندا. نامەوێ لێرەدا باسەکە درێژ بکەمەوە، تەنها باسێکی فیلمی (The Book Of Eli) دەکەین.

(The Book Of Eli)، یەکێکە لەو فیلمانەی کە باسی جیهان دوای وێرانبوونی (Post-Apocalypse) دەکات و تیایدا چەند خاڵێکی گرنگ و باشی تێدایە بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتر لەم بابەتە، ئێمە

سەرەتا چیرۆکی فیلمەکە دەنووسینەوە بە کورتی بۆ ئەوەی باشتر تێبگەین.

(Eli) بە کوردی(ئیلای)، پیاوێکی رەشپێستە لە جیهانێکدا دەژی کە برسییەتی و توێنییەتی بلاوترین کێشەی مرۆڤە، لە جیهانێکدا کە بەهۆی جەنگەوە وێرانبووە، ئەو رێگایەکی گرتۆتە بەر و هەمیشە لە جولەدایە بۆ ئامانجێك کە کەس نازانێت تەنها خۆی نەبێت. لەگەڵ خۆشی کتێبێکی هەلگرتووە کە وەك لە فیلمەکەدا باسکراوە ئەو کتێبە ئینجیلە(کتێبی دینی مەسیحیەت)، ئیلای لە رێگایدا توشی زۆر ناخۆشی دەبێت، لە هەندێك شوێن توشی مرۆڤخۆرەکان دەبێت، لە هەندێکیتر توشی ئەوانەی کە ئەو کتێبەیان دەوێت بۆ مەبەستی خۆیان، بەلام ئیلای خاوەن باوەڕێکە کە پێی وایە کەسێك ئەو کارەی پێ راسپاردووە و دەیەوێت ئەو کتێبە ببات بۆ شوێنێك کە بتوانێت لەوێدا بلاوبێتەوە. گەر باسی گرنگی کتێبەکە بکەین، ئەوە دەتوانین لە هەندێ گفتوگۆی فیلمەکەوە بزانین، ئەو کەسەی لە فیلمەکەدا ئەو کتێبەی دەوێت، خاوەن باندێکی گەورە و سەرۆکی شارێکی بچوکە، لەوێدا ئیلای دەبینێت و دوای داوەتکردنی دەزانێت کە ئەو کتێبەکەی پێیە، لە دیمەنێکدا کە ئیلای دەیەوێت شوێنەکە بەجێبهێلێت، پێی دەلێت: تۆ پێویستە ئەو کتێبە بدەی بەمن، تۆ نازانیت ئەو کتێبە چ

کاریگەری و گەورەییەکی هەیە، پێی دەڵێت ئەو کتێبە هۆکارە بۆ گەڕانەوەی مرۆڤەکان لە تاریکاییدا بەرەو ڕوناکی، پێی دەڵێت ئەگەر من خاوەنی ئەم کتێبە بم، ئەوە دەتوانم ئەو خەڵکە بانگ بکەم و فێریان بکەم کە چۆن بژین و چۆن لەم حاڵەتەدا خۆیان رزگار بکەن. بەلآم ئیلای پێی دەڵێت من پێتی نادەم، ئەویش دەڵێت بۆچی، ئیلای دەڵێت چونکە ئەو شوێنە شایەنی ئەو کتێبە نیە و ئێرە ئەو شوێنە نیە کە ئەو کتێبە بتوانێت بلآوبێتەوە تێیدا.

ئامانجی ئیلای گەیشتنە بە ڕۆژئاوا، ئەو شوێنەی کە هەندێك لە مرۆڤەکانی تێدا ماوە و خەریکی دووبارە بنیاد نانەوەی مرۆڤایەتین، لەم پێناوەشدا چەندین کتێب چاپ دەکەنەوە، بەهۆی ئینجیلەکەی ئیلایشەوە، دەتوانن کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان بکەن و باوەڕیان بگەڕێننەوە.

هەرچۆنێك بێت، ئێمە ئەو کتێبە وەك باوەڕ هەژمار دەکەین، (ئیلای)ش وەك کەسێك کە دەیەوێت ئەو باوەڕە بگەڕێنێتەوە بۆ مرۆڤایەتی، لەم نێوەندەشدا، ئەوانەی کە داوای ئەو باوەڕە دەکەن ئەو کەسانەن کە دەیانەوێت بۆ مەبەستی خۆیان ئەو باوەڕە بەکاربهێنن، بەلآم قسەکانی ئەو پیاوە بەرامبەر بە کتێبەکە(باوەڕ) هێمای زۆر گرنگبوونی کتێبەکە نیشان دەدەن، بە شێوەیەك کە دەتوانین بڵێین گەڕانەوەی باوەڕ

بۆ مرۆڤایەتی لەو کاتەدا، پێویستییەکە، مرۆڤەکان لە سەردەمی جیهان دوای وێرانبوونی (Post-Apocalypse)، باوەڕیان بەرەو لاوازبوون دەچێت بەڵکو بگرە هیچ شتێکیان بیرنامێنێت بە ناوی باوەڕ. ئەوەتا لە دیمەنێکدا ئەو کچەی لەگەڵ (ئیلای)دایە دوای ئەوەی (ئیلای) نزایەکی بۆ دەخوێنێتەوە کە لە ئینجیلدا هەیە و نزایەکی باوە، کەچی ئەو دەربارەی نازانێت، بۆیە لە (ئیلای) دەپرسێت کە ئایا ئەو شتەی کە گوتی لە کتێبەکەدا هەیە، ئەویش پێی دەڵێت بەڵێ. یان لە دیمەنێکی تردا (ئیلای) دەڵێت کە ئەو لە نێوان دوو جیهاندا بووە، جیهانی پێش وێرانبوونی زەوی و جیهانی دوای وێرانبوونی زەوی، لەم نێوەندەشدا دەتوانین بڵێین ئەو کچەی قسە لەگەڵ ئیلای دەکات لە دوای وێرانبوونی جیهان(Post-Apocalypse) لە دایك بووە، بۆیە هیچ شتێك دەربارەی باوەڕ و دین نازانێت.

لێرەدا چەند شتانێکمان بۆ دەردەکەوێت، یەکەم ئەوەیە کە مرۆڤ بەهۆی لە دەستدانی باوەڕی لە کاتی وێرانبوونی زەویدا، لە جیهان دوای وێرانبوونیدا هەر بێ باوەڕ دەبێت، بۆیە نەوەکانیشیان کەسانێك دەبن کە باوەڕیان نیە و هیچ شتێك دەربارەی دین نازانن، نەوەیەك درووست دەبێت کە ئاشنا نیە بە هیچ شتێك جگە لە برسییەتی و تێنوێتی، نەوەیەك نە

پەروەردەیەکی تەواوی هەیە، نە شتێك کە بتوانێت بەهۆیەوە خۆی ڕۆشنبیر بکات. دووەم بریتییە لەوەی کە ئەو نەوەیەی لە نێوان دوو جیهاندا ژیاوە هەوڵی گەڕانەوەی ئەو باوەڕە دەدات لە نێو خەڵکیدا، بەلاّم کەسانێك هەن بۆ مەبەستی خۆیان دەیانەوێت، کەسانێکیش بۆ گەڕانەوەی باوەڕ بۆ مرۆڤایەتی دەیانەوێت، وەك (ئیلای) . سێیەم گرنگی گەڕانەوەی باوەڕە بۆ نێو ئەم خەڵکە، ئەو پیاوە بە ئیلای دەڵێت کە ئەو کتێبە دەتوانێت ئەو خەڵکە تێبگەیەنێت کە چیبکەن و چینەکەن لەم سەردەمەدا، بەو واتایەی خەڵك بەهۆی باوەڕەوە دەزانێت کە خەریکی چیبێت یاخود چیبکات. ئەوەش گرنگی باوەڕ دەردەخات.

بۆیە دەتوانین بڵێین گەڕانەوەی باوەڕ بۆ مرۆڤایەتی خاڵی دەستپێکردنەوەی دروستبوونی شارستانیەتە لە جیهان دوای وێرانبوونیدا، بە شێوەیەك وەك سەرەتای دروستبوونی مرۆڤایەتی وایە، کاتێك مرۆڤایەتی فێردەبێت، لە ناسینی خوداوە فێردەبێت، ئینجا بە دروستبوونی باوەڕ لە نێو دڵیدا، ئینجا بەرەو زەوی خودا بەڕێدەکەوێت و هەوڵی بوژانەوەی دەدات بە درووستکردنی شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەی.

## خاڵی پێنجەم :

## "جیهان دوای وێرانبوونی: بیرۆکەیەکی نوێی (دایڤد میشێل)"

(دایڤد میشێل) نووسەری ڕۆمانی (Cloud Atlas)، لە ڕۆمانەکەی کە لە بەشی یەکەم خوێندنەوەمان بۆ کردووە، کاتێك باسی شەش سەردەمی جیاواز دەکات، یەکێك لەو سەردەمانە بریتییە لە جیهان دوای وێرانبوونی (Post-Apocalypse)، بەڵام ئەو بە شێوەیەکی تەواو جیاواز لە هەر بیرۆکەیەکی تر باسی کردووە، ئەوەش دەتوانین لە فیلمی (Cloud Atlas) بە هەمان ناوی ڕۆمانەکەی ببینین.

بیرۆکەی گشتی جیهانی دوای وێرانبوونی زەوی لە زۆربەی فیلمەکاندا هەمان بیرۆکەیە، بوونی برسیەتی، مرۆڤخۆرەکان، مانەوەی کەسانێکی کەم لە ژیاندا، کەمی خۆشەویستی و هەست و سۆز. چەندین خاڵی تر کە زۆربەیان بەیەك دەبەستێتەوە، یاخود بە شێوەیەکی تر لەم فیلمانەدا گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ شارستانیەت و پێشکەوتن کارێکی ئاسان و سادە دیارە یان بە واتایەکی تر، مرۆڤ لە جیهان دوای وێرانبوونی هێشتا هەندێك هێما و شێوەی پێوە دیارە کە مرۆڤەکان بە کلتوری جیهانی پێشوتر دەبەستێتەوە، بۆ نموونە ئەو شێوە جلەی لەبەریانە یاخود ئەو

جۆره هەڵسوکەوتەی کە دەیکەن. بۆ نموونە لە فیلمی ( The Book of Eli) پەیوەندی مرۆڤەکان بە جیهانی پێش وێرانبوونی بە تەواوی دیارە، ئەوەتا ئیلای(کاراکتەری سەرەکی) ئای پۆدێکی(ipod ) پێیە و گوێ لە مۆسیقا دەگرێت لێیەوە، ئەوە پەیوەندییەکی ئاشکرایە لە نێوان کلتوری مرۆڤەکان لە جیهان پێش وێران بوون و دوای وێرانبوونی.

بەڵام ئەوەی دایڤد لە ڕۆمانەکەی(Cloud Atlas) باسی دەکات، تەواو جیاوازە، ئەو پێی وایە مرۆڤ سنوری هەیە بۆ پێشکەوتن، سنوورێك بۆ تەکنەلۆژیا، سنوورێك بۆ شارستانی بوون، کاتێکیش ئەو سنوورە دەگات بە کۆتایی، بەهۆی یەکێك لە هۆکارەکانی وێرانبوونی زەوی ئەو سنورە کۆتایی پێدێت و مرۆڤایەتی دەگاتەوە بە سەرەتا، سەرەتایەك بۆ بونیادنانی شارستانیەتێکی تر، وەك ئەوەی لەسەر ڕێڕەوێکی بازنەیی بێت و کاتێك دەگاتەوە خاڵی دەستپێکردن، بڕوخێت و دووبارە دروستبێتەوە.

لەو ڕۆمانەدا، مرۆڤەکان لە جیهان دوای وێرانبوونی(Post-Apocalypse)، تەواو جیاوازن، نە هیچ هۆکارێکی پێشکەوتنیان پێوەدیارە نە شتێك کە لە شارستانیەتی جیهانەکەی پێشتر بچێت، تەواو تەواو مرۆڤێکی سەرەتایین، ڕاودەکەن تا بژین، خانوەکانیان لە بەرد و

داره. بەڵام بۆچی و چۆن مرۆڤ گەیشت بەو ڕادەیەی هیچ شتێك دەربارەی ڕابردووی خۆی نەزانێت؟

وەك باسمانکرد دایڤد پێی وایە کاتێك مرۆڤ دەگات بە کۆتا سنووری شارستانی بوون و پێشکەوتن، ئیتر دەبێت هۆکارێك هەبێت بیگەڕێنێتەوە بۆ سەرەتاکەی، ئەو کاتەی بە بەرد ئاگری دەکردەوە لە ئەشکەوتەکان، بۆیەش لە ڕۆمانەکەی سەردەمی پێش کۆتایی هاتنی جیهان یاخود وێرانبوونی زەوی، مرۆڤەکان لە پێشکەوتنێکی بێ سنووردن، هیچ شتێك نیە بتوانێت ڕایانبگرێت، بەڵام وەك دیارە جموجۆڵێکی یاخیگەرانە هەیە لە دەسەڵات و دەیەوێت ئەو سیستمەی هەیە لەناوبچێت، بۆیە شەڕێکی ناوەخۆی لێدەبێتەوە و تەواو وێرانبوونی شارستانیەتی مرۆڤ نیشان دەدات. ئەوکاتە، ئەوانەی لە مرۆڤەکان ماونەتەوە، دەستدەکەنەوە بە ژیان و بە شێوەیەك خۆیان ڕزگار دەکەن، بەهۆی سەرقاڵ بوونیان بە خواردن پەیاکردن و ژیانی ڕۆژانەیان، بیریان دەچێتەوە کە کێبوون و چین، دوای ئەوەش پێش کۆتایی هاتنی جیهان، (وەك لە بەشی یەکەم باسمانکردووە لەم کتێبە). (سۆنمی) ئەو کچەیە کە دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەو شۆڕشە و دروستبوونی شەڕە ناوخۆییەکە و وێرانبوونی زەوی، کە دواتر کاریگەری دەبێت لەسەر جیهانی دوای وێرانبوونی زەوی و مرۆڤەکان بە

چاوێکی گەورە و ڕێزەوە سەیری دەکەن، وەك سیمبولێك بۆ ئازادی و خودایەك.

دایڤد ئا لێرەدا دەیەوێت بڵێت، کاتێك مرۆڤەکان هاتنە دەرەوە لە دوای وێرانبوونی جیهان، چیرۆکی (سۆنمی)یان بۆ منداڵەکانیان گێڕاوەتەوە، ئەوە دوای ئەوە، زۆرێك زیادەڕەویشی تێدا کراوە، تا وای لێهات، ئەوەیەك (سۆنمی ) بە خودا بزانن و بیپەرستن. ئا لێرەدا دایڤد لە دەستدانی باوەڕی مرۆڤی لە دوای وێرانبوونی زەوی باسکردووە. لە زۆر پێشبینیدا لە دەستدانی باوەڕ بەهۆی سەرقاڵبوونی مرۆڤ بە خواردن و لەدەستدانی مۆراڵە، بەڵام لە لای دایڤد بەهۆی گۆڕانی پەرستنی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیە، لە خوداوە بۆ پەرستنی مرۆڤ.

ئەو پێشبینییەی دایڤد بۆ شارستانیەت و پێشکەوتنی مرۆڤ هەیەتی دەتوانین لەسەر ڕابردووی مرۆڤایەتیش جێبەجێی بکەین، زۆر چیرۆکمان گوێ لێبووە کاتێك مرۆڤەکان کەسانێکی خودا پەرست بوون بەڵام گۆڕان بۆ پەرستنی بت و کەسانێکی تر جگە لە خودا، یان وەك دارمانی ئەو پێشکەوتنەی لە کۆنی میسرییەکان هەبووە هەم لە دروستکردنی هەرەمەکانەوە تا دروستکردنی چەندان شتی تر، لە کاتێکدا زۆر ئەستەمە مرۆڤ لە ئێستادا بتوانێت کارێکی لەم شێوەیە ئەنجام بداتەوە. یاخود

ئەوەی کە باس دەکەن ولاّتێك لەم جیهانەدا هەبووە بە ناوی (ئەتلانیس) کە ئەفلاتوون باسی کردووە، خاوەن پێشکەوتنێکی بێ سنوور و شارستانیەتێکی گەورەبوون، بەلاّم لە ناکاو دیار نەماوە، زۆرێك وای بۆ دەچن کە نوقمی ژێر زەریاکان بووە. دەکرێ ئەوانە گەیشتنی مرۆڤ بن بە دوا سنوری شارستانیەت، لەوێدا هیچ شتێك نەمابێت تا مرۆڤ بیەوێ زیاتر گەشەی پێبدات و فێری بێت، بۆیە بە لە ناوچوونی کۆتایی پێدێت. بەو پێشبینییەی (دایڤد) بێت، دروستکردنی هەرەمەکان بۆ نموونە، دواین سنوری شارستانیەتی ئەوکاتەی میسرە، لەناوچوونی ئەو شارستانیەتە گەڕانەوەی مرۆڤە بۆ سەردەمێکی وەك ئێستا، کە توانای بنیادنانی شتێکی لەو جۆرەی نەبێت بەو کەرستانەی ئەوکات و سەرسام بێت لە چۆنیەتی دروستکردنیدا. ڕەنگە ئێمەش لە ئێستادا چەندین شارستانیەتمان تێپەڕاندبێت، بە پێی ئەو پێشبینییەی (دایڤد) بێت، ئێمە لە ئێستادا خەریکی دروستکردنەوەی شارستانیەتێکی ترین .

# "ڕەنگدانەوەی زانستی خەون بینین لە چەند فیلمێکدا"

خەون بریتییە لە زنجیرە خەیاڵێك کە بەهۆی سۆز و بیرکردنەوە و وێناکردن(Image) لەکاتی خەوتندا بە مێشکی مرۆڤدا دێت. هۆکار و دروستبوونی خەون بە شێوەیەکی گشتی پێناسەنەکراوە لەبەر ئاڵۆزی. بۆیە شیکردنەوەشی لە لایەنی زانستی ئەستەمە، لەگەڵ ئەوەی لە چەند لایەنی تری وەك دەروونی و دینی و فەلسەفی پێناسەی بۆ کراوە. لە لایەنی زانستی پەرەیان بە بواری خەون و هۆکارەکانیدا تا ئەوکاتەی گەیشتنە ئەوەی بتوانن چەند شتێك دەربارەی خەون بزانن، وەك ئەوەی ئایا خەون لە کاتی خەوتندا چەند دەخایەنێت و هەندێك خەون سەرچاوەیان لە هەستکردنی حاڵەتی خەوتنی ئەو کەسە دێت، یاخود ئەوەی کە خەون چەند جۆرێکی هەیە و پەیوەندی مێشك بە خەونەوە چۆنە و چییە، ئەو زانستە ناونرا بە ئۆنەیرۆلۆجی ( Oneirology ).[٢٢] لە ڕاستیدا لە ڕووی زانستییەوە توانیان چەند ئەنجامێکی گرنگ بەدەست بهێنن و زۆرێك لەو پێناسە هەڵانە هەڵبوەشێننەوە کە لە کولتوری کۆمەڵگاکان باوبوو. بەڵام هێشتا زۆر شت هەن نەیانتوانیوە پێی بگەن، بۆ نموونە ئایا خەونە هەواڵدەرەکان لە کوێوە دێن و سەرچاوەیان چییە؟

ئەوەی لەم چەند ساڵەی دوایی باوبوو، تێکەڵکردنی خەیاڵە زانستییەکانی خەون بوو لەگەڵ فیلمەکان. خۆی سروشتی دۆزینەوەی هەر زانستێکی نوێ کاریگەری لەسەر زۆر لایەن درووستدەکات، بۆ نموونە لە پەنجاکان بەهۆی چەند راپۆرتێکی بینینی کەشتی ئاسمانی لە لایەن هاوڵاتیانەوە، کاریگەری لەسەر زۆربەی میدیاکان درووستکرد تا ئەو کاتەی بوویە قسەی سەر زاری خەڵکی و بابەتی ڕۆژانە، بەم شێوەیە شۆڕشێکی فیلمی "بوونی کەشتی ئاسمانی و بیانیەکان(Aliens) و ژیان لەسەر هەسارەی تر" درووست کرد، ژمارەی ئەو فیلمانەشی لە بنەمای ئەو خەیاڵانەوە درووستکراوە زۆر زۆرن. بۆیە لە سەرەتای سەدەی بیستەمیش دۆزینەوەی هەندێك لەو ڕاستییانەی خەون بەهۆی زانستەوە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو، کە دواتر چەند فیلمێکی لەبارەوە دەرهێنرا، لەم فیلمانەش: ( Open Your Eyes□١٩٩٧, Waking Life□٢٠٠١ , The Science of Sleep□٢٠٠٦, Paprika□٢٠٠٦, Inception□٢٠١٠) کە ئێمە لێرەدا بیرکردنەوەی دەرهێنەر و فیلمەکە دەخەینەڕوو و دەگەڕێینەوە بۆ هۆکاری هەڵبژاردن و سەرچاوەی فیکرەکە و لێکدانەوەی.

## خاڵی یەکەم :

# "ویستی تێکەڵکردنی خەون و واقیع لە فیلمەکان"

کاتێك باس لە خەون دەکەی، باس لە شتێك دەکەین کە دوور لە واقیع و ڕاستیە، بەڵام ئەوەی لە فیلمەکاندا تێبینی دەکریٚ پیشاندانی خەونە وەك شتێکی جیانەکراوەی واقیع، یاخود بریتییە لە پێشاندانی هەڕەشەی تێکەڵبوونی خەون لەگەڵ واقیع. بەڵام ئایا دەکرێت شتێکی شاراوە هەبێت لەمەڕ ئەو بابەتە و ئێمە نەیزانین؟ شتێك هۆکار و سەرچاوەکانی خەونمان بۆ شیبکاتەوە یاخود هیچ نەبێت بیرۆکەیەکمان پێبدات بۆ ئەوەی بە هەمان شێوە لە فیلمەکاندا دایبنێین؟

سەرەتا ئەگەر لە هۆکارەکانی دروستبوونی خەونەوە دەستپێبکەین. د.عەلی وەردی لە کتێبەکەی بە ناوی (خەونەکان لە نێوان زانست و بیروباوەڕدا – الأحلام بين العلم والعقيدة).[٢٤] تێیدا ئاماژە بە چەند هۆکارێکی ڕوودانی خەون دەکات، لەوانە: ئەو هەستەی لە کاتی خەوتندا هەتە، بۆ نموونە ئەگەر تۆ لە کاتی خەوتندا گەرمیەك بە لەشت بنێن، لە خەوەکەتدا ڕەنگە هەست بکەی لە ژوورێکی پڕاوپڕ لە ئاگری. هۆکارێکی تر بریتییە لە نەست، ئەو بیرکردنەوە و گفتوگۆ و وێنانەی، یاخود ئەو

کردارانەی ویستی کردنت هەبووە ، یاخود هەر شتێك لە نەستتدا کۆبۆتەوە، کاتێك عەقڵ لە بیرکردنەوە دەکەوێت لە کاتی خەوتندا، نەست دەست دەکات بە خەیاڵکردنی گشت ئەو شتانە و فڕێدانە دەرەوەیان. هۆکارێکی تر کە تا ئێستا زاناکانیش هۆکاری دروستبوونی نازانن بریتییە لەو خەونانەی کە هەڵگری هەواڵ یان ڕووداوێکن هێشتا ڕووینەداوە. عەلی وەردی چەند ڕووداوێکی لەم جۆرەی لە کتێبەکەیدا باس کردووە.

بۆ باسکردن لە جۆری بیرکردنەوەی ئەو فیلمانە پێویستە سەرەتا لە ڕووە زانستیەکەی سەیر بکەین. لە ڕووی زانستییەوە خەونی نەستی(Unconscious Dream) و خەونی ئاگایی (Lucid(semi-conscious) Dreaming) هەیە، خەونی نەستی ئەو خەونەیە کە هەر مرۆڤێکی ئاسایی لە کاتی خەوتندا دەیبینێت. خەونی ئاگایش ئەو جۆرە خەونەیە (لێکۆڵینەوە زانستیەکان دەربارەی ئەم جۆری خەونە چەند ساڵێکە بە شێوەیەکی فراوان دەستی پێکردووە) کە تێیدا مرۆڤ دەتوانێت لە خەوەکەیدا کۆنترۆڵی ڕووداوەکانی دەوروبەری بکات یاخود ئەو شتانەی لە خەوەکەیدا ڕوودەدەن، واتە وەك دەرچوون لە جەستە وایە، هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەو حاڵەتە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ڕوودەدات لە کاتێکدا هەندێکیتر کار لەسەر درووستکردنی دەکەن.[٢٥] وەك

ئەوەی لە خەوەکانتدا هەولبدەی بپرسی لەخۆت کە ئایا  ئەوە خەونە یان نا ؟ زۆرێکیتر بەو حاڵەتە دەگەن لە خەوەکانیاندا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی، بۆ نموونە بیرمە هاورِێیەك دەیگوت لە خەومدا لەگەڵ دایکم قسەم دەکرد لە ناکاو وەك بلێی بێمەوە سەر خۆم لە دایکمم پرسی ئەی تۆ نەمردووی؟ ئەویش وەلامی دامەوە بەڵێ بەلاَم لێرە زیندووم، نموونەی تر لەو جۆرە زۆرە . لێرەدا زانایان لە ژێر کاریگەری تیۆرەکەی فرۆید پێیان وایە جۆری خەون تەنها خەونی نەستی و خەونی ئاگایی هەیە. تەنانەت ئەو خەونی ئاگاییەش دەتوانین بلێین جۆرێکی نوێیە. فرۆید پێی وایە مرۆڤ بەهۆی خەونەوە هەست و حەزە کپ کراوەکانی وێنادەکات، ئەو نموونەی ئەوە دەهێنێتەوە کە شتێك لە واقیعدا ناتوانیت پێی بگەی، لە خەوندا وێنای بە دەستهێنانی دەکەی، بۆ ئەوەش نموونەی حەزی سێکسی لە واقیع و خەوندا هێناوەتەوە. هەرچۆنێك بێت ئەوەی گرنگە قسەی لەسەر بکەین بریتییە لە خەونی ئاگایی کە زۆربەی فیلمەکانی لەسەر ئەو بنەمایە دەرهێنراوە.

فیلمی (Inception) نوێترین جۆری ئەو فیلمانەیە لە ئێستادا کە تێیدا باسی چۆنیەتی تێکەڵکردنی خەون و واقیع دەکات بەهۆی تەکنەلۆژیاوە. (Inception) لە دەرهێنانی (کریستۆفەر نۆلان)ە، ئەو

دەرهێنەرەی پارمەتیدەر بووە لە دەرهێنانی زۆربەی فیلمە بەناوبانگەکان، دەربارەی (Inception) دەڵێت: (ئەوەی من ویستومە بیکەم ئەوەیە وا لە خەڵك بکەم خەون بینینی ئاگاییانە (Conscious Dream) وەك بەهرەیەکی لێبێت بۆیان، وەك لە فیلمەکەش دەبینین بەهۆی ئامێرێکەوە دەبێت). دیارە کە بەهرەمەند بوون لە خەونی ئاگاییانە بەهۆی ئامێرێکەوەیە لە فیلمی (Inception)، بەڵام لە فیلمی ( Waking Life) بۆ نموونە کە بە شێوەیەکی کارتۆنی درووستکراوە، دەرهێنەر پێی وایە بەهرەمەند بوون لە خەون بینینی ئاگاییانە پێویست بە ئامێر و تەکنەلۆژیا ناکات، بەڵکو تەنها ئەوەی پێویستە کە ئەزموون کۆبکەیتەوە لە خەونە نەستییەکانت تا ئەوکاتەی دەتوانی هۆشیار بیت تێیاندا. لە فیلمەکەدا گفتوگۆیەك ڕوودەدات لە نێوان دوو کەسایەتی، وەك پێدەچێت یەکێکیان بەهۆی خەونی ئاگاییەوە چووەتە نێو خەونی کەسێکی تر و لە خەوەکەدا دەربارەی خەونی ئاگاییانە قسەی بۆ دەکات و پێیّ دەڵێت ئێستا من بەهۆی بیرکردنەوەی خۆمەوە قسەت بۆ دەکەم، خۆم کۆنترۆڵی ئەو خەونە دەکەم، هەر شتێك بمەویّ دەتوانم بیکەم چونکە هۆشیارم، ئەگەر تۆش دەتەوێت خەونی ئاگاییانە ببینیت ئەوە پێویستە ئەزموون پەیا بکەی لەو خەونانەی کە ئاگەداریان نیت، ئەویش دەڵێت چۆن، پێی دەڵێت بۆ

نموونه هەر کاتێك ئەگەر زانیت لە ناوەڕاستی کارێکدای بێ ئەوەی سەرەتاکەی بزانیت دەبێ لەخۆت بپرسی کە ئایا ئەوە خەونە یان ڕاستیە، دواتر بۆ نموونە پلاکی گلۆپێك بکوژێنەوە ئەگەر گلۆپەکە نەکوژایەوە ئەوە بزانە کە تۆ لە خەوندای و دەست بکە بە بیرکردنەوە، پاشان هەوڵبدە لە هەر خەوێکدا پێش هەمووشتێك بیربکەیتەوە تا ئەوکاتەی خەوێکی ئاگاییانە درووستدەکەی.

دیارە کە ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئەم دوو کەسە لە فیلمی (Waking Life)، چەند خاڵێکی هاوبەشی هەیە لەگەڵ فیلمی (Inception) جگە لەوەی چەند خاڵێکی ناکۆکیشیان هەیە. لە هەردوو فیلمەکە کەسێك بەهۆی بینینی خەونی ئاگاییەوە دەتوانێت بچێتە نێو خەونی کەسێك کە خەونی نەستی(نائاگایی) دەبینێت، لە هەردوو فیلمەکە ئەو کەسەی خەونی ئاگایی دەبینێت دەتوانێت هەر شتێك بیەوێت بیکات، لە هەردوو فیلمەکە ئەو کەسانەی خەونی ئاگایی دەبینن یاخود دروستی دەکەن، بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیانە بۆ نموونە لە (Inception) بۆ مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی خەونی کەسانی ترە یاخود وەك لە دیمەنێك پیشان دەدات کە زۆرێك لەوانەی بەتەمەن چوون بۆ مەبەستی گەنج بوونەوە و رابواردن بە کاری دەهێنن و خەونی ئاگایی دروست دەکەن، ئەو

خاڵەی ناکۆکە لە نێوان ئەم دوو فیلمە، ئەوەیە کە لە (Inception)
خەون بینینی ئاگایی بەهۆی ئامێرێکەوەیە و لە فیلمی (Waking Life)
بەهۆی وەرگرتنی ئەزموونەوەیە لە خەونی نەستی(نائاگاییانە).

هەڵبەتە لە ئێستادا ئەو بیرۆکەیەی لە فیلمی (Waking Life)
بەکارهاتووە لە واقیعی ئێستا نزیکە، بەو پێیەی وەك سەرەتا باسمان کرد
زانایان خەونیان کردۆتە دوو بەش بەشێکی نەستی و بەشێکی ئاگاییانە کە
پێی دەوترێ (Lucid Dreaming)، بۆیە ئەوەی لە ( Waking
Life) بەکارهاتووە ڕەنگە هەر مەبەستی ئەو جۆرە خەون بینینە بوبێت،
ئەو گفتوگۆیەشی کە باسمان کرد لە فیلمەکە زۆر یەکدەگرێتەوە لەگەڵ
ئەوەی کە زانایان باسی دەکەن بۆ پەیداکردنی ئەزموون لە خەونی نەستی.
بەلام (Inception) پێشبینی داهاتوو دەکات، داهاتوویێك کە تێیدا
زانستی خەون بینینی ئاگاییانە (Lucid Dreaming) لە ئامێرێکدا
جێگیر دەکرێت، کە بەهۆیەوە دەتوانیت بخەویت و لە خەوەکەتدا ئەو شتانە
دروستبکەی کە مێشکت پێت دەڵێت یاخود بیریان لێدەکەیتەوە، لەم
پێناوەشدا نموونەیەکی زۆر جوانی وروژاندووە کاتێك کەسایەتیەکی فیلمەکە
بە ناوی (دۆمینیك کۆب) کە (لیۆناردۆ دیکاپریۆ) ڕۆڵەکەی گێڕاوە،
جیهانێکی تایبەت بەخۆی و هاوسەرەکەی دروستکردووە لە خەونەکانی

بەهۆی ئامێرەکەوە، لەوێدا هەر شتێك دەیانەوێت دەستەبەریان کردووە، (دۆمینیك) لە ناو خەونەکەیدا چووەتە نێو چەند خەونی تر ( لە (Inception) بەهۆی ئامێرەکەوە دەتوانن لە نێو خەونەکان خەونی تر ببینن، ئەوەش بۆ ئەوەی کاتێکی زۆریان بۆ بگێڕێتەوە، چونکە کاتژمێرێکی ناو خەونێك یەکسانە بە ٥ خولەکی واقیع، بۆیە تا چەند بچیتە نێو خەونەکانەوە، ئەو ژمارەیە زۆرتر دەبێت تا ئەوکاتەی ژیانێکی هەتا هەتایی دەبێت (بەپێی فیلمەکە). ) بۆ ئەوەی کاتەکەی زۆر بێت لەگەڵ هاوسەرەکەی، دوای گەڕانەوەیان لە نێو جیهانی خەونەکان هاوسەرەکەی باری دەروونی تێکدەچێت و خۆی دەکوژێت چونکە هەروا دەزانێت کە لە خەوندان لەگەڵ دۆمینیك (خۆکوشتن لە خەونەکاندا هۆکارە بۆ بە ئاگا هاتنەوە). مردنی هاوسەرەکەی (دۆمینیك) یادگاریەکی خراپ لەسەر مێشك و دەروونی (دۆمینیك) بەجێدەهێڵێت بە شێوەیەك لە خەونەکانیدا خێزانەکەی دەبینێت و بەهۆی ئەو یادگاریە تاڵەوە. لێرەوە (Inception) زانیارییەکی گرنگمان پێدەدات، ئەو پێمان دەڵێت کە یادگاری هۆکارە بۆ دروستبوونی خەون و بەشداربوون تێیدا، پێمان دەڵێت کە جگە لەو ویست و ئارەزووانەی لە نەستمان جێگیرن بۆ کردنیان، یادگاری خۆش و تاڵیش جێگیرە تێیدا کە هۆکارە بۆ شێواندن و بوون لە

بەشێکی خەونەکان. زۆر جار گوێمان لێدەبێت دەڵێن فلان کەس بەهۆی ڕووداوێکەوە شەوانە خەوی لێناکەوێت یاخود کەسێك لەبەر کوشتنی کەسێك کە ویستی کوشتنی نەبووە، شەوانە لە خەوەکەیدا دەیبینێت، ئەوانە گشتی دەچنەوە بازنەی بوونی یادگاری لە نەستدا و بەشداربوونی لە هاوکێشەی دروستبوونی خەوندا، یان زۆرێك لەو سەربازە ئەمریکییانەی لە جەنگی عێراق و ئەفغانستان هاتنەوە ماڵەکانیان، شەوانە بە دەست کابوس و خەونە خراپەکانیان ناتوانن بخەون.

بەڵام لە لایەکی ترەوە، گەیشتنی تەکنەلۆژیا بەو ئاستەی کە لە فیلمی (Inception) پێشبینی کراوە، بەوەی ئامێرێك بەشداربێت لە خەونەکانمان و بەهۆیەوە خەون ببینین، ترسێکی گەورەمان پێدەدات، ئەوەش دەتوانین لە فیلمی ئەنیمەیشنی (Paprika) ببینین. ئەو فیلمەش یەکێکە لەوانەی باس لە داهاتووی زانستی خەون دەکات کە چۆن بەهۆی ئامرێکەوە بە ناوی (DC mini) دەتوانین بەشداری خەونی کەسانی تر بین و بەو شێوەیە خەون ببینین کە دەمانەوێت. ئەوەی (Inception) لە (Paprika) جیا دەکاتەوە بریتییە لەوەی لە فیلمی (Paprika) بەهۆی ئامێرەکەوە دەتوانی دوای هەڵسانت لە خەو، ئەو خەونە ببینیەوە کە بینیوتە. مەترسیەکە ئەو کاتە دەست پێدەکات کە ئەو

ئامێرە یارمەتیدەر دەبێت بۆ گەیشتنی کەسانێك بە خەونی کەسانێکیتر و چەسپاندنی هەندێ بیرۆکە لە واقیعیاندا، یاخود تەنانەت کوشتنیان! (Paprika) ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەگەر ڕۆژێك بێت و خەون ببێتە هۆکاری دەستکاری کردنی واقیع وەك کوشتنی مرۆڤ تێیدا، ئەوا مرۆڤایەتی بەرەو دواکەوتن(نەمان) دەچێت بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی کردویەتی، ئەوکات هەر کەسێك بەهۆی رق و بەخیلیەوە دەتوانێت لە خەوێکدا ئەو کەسەی بیەوێت بیکوژێت. هەرچەندە لە (Paprika) کەمێ زیادەرۆیی کراوە بەوەی کە کەسێك واقیع و خەون تێکەڵ دەکات بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وانەیەکی گرنگە بۆ ئێمە پێش ئەوەی بگەین بە پێشکەوتنێکی لەو جۆرە. بۆیە دەتوانین بڵێین فیلمی (Waking Life) باس لە ئێستای خەون بینینی ئاگایی دەکات، فیلمی (Inception) باس لە داهاتووی خەون بینینی ئاگایی دەکات بەهۆی ئامێرەوە، فیلمی (Paprika) باس لە داهاتوویەکی دوور دەکات کە مرۆڤایەتی بە دەست ئامێرێکی لەو جۆرەوە دەناڵێنێت.

بەڵام ئێمە لە ئێستادا کە تەنانەت لە ئەزموونداری خەونی ئاگایی دڵنیا نین چۆن دەتوانین گشت ئەوانەی تر وێنا بکەین؟ لە فیلمی ( The Science of Sleep) کە فیلمێکی فەرەنسیە، کوڕێك بە ناوی

(ستێفان) ئەوەندە لەگەڵ خەونەکانی تێکەڵ بووە کە تەنانەت بەرنامەیەکی تایبەت بەخۆی لە خەونەکانی داناوە و تێیدا ویست و ئارەزووەکانی خۆی باس دەکات، بەڵام لەم فیلمەدا هیچ ئاماژەیەك بە خەونی ئاگایی نەکراوە، ئەو کورە بەهۆی تێکەڵبوونی زۆر لەگەڵ خەونەکانی، زۆر جار واقیع و خەون لەیەك جیا ناکاتەوە، تا ئەو ڕادەیەی ئەوەی لە خەون دەیبینێت وا دەزانێت لە واقیعدا بوونی هەیە.

کەواتە ئایا دەتوانین بڵێین کە هیچ شتێك بە ناوی خەونی ئاگایی بەو شێوەیەی کە باس کراوە بوونی نیە؟ چونکە ئەگەر حەز و ویستەکانمان لە واقیع رونەدات، ئایا دەتوانین لە خەوندا بەرجەستەی بکەین و ئایا تێرمان دەکات؟ ئەگەر نەخێر، کەواتە خەون بینینی ئاگایی تەنها خەیاڵ بینێکی ئەو شتانەیە کە ناتوانین لە واقیعدا پێی بگەین. لێرەدا ئەو باسەم وەك چیرۆکەکەی دۆنکیشۆت(Don Quixote) دێتە بەرچاو، کاتێك ئەلۆنسۆ، بەهۆی زۆر خوێندنەوەی کتێب و چیرۆکەکانی دەربارەی سوارچاکی، خەیاڵێکی گەورەی لا دروست بووە کە ڕۆژێك دێت ئەو دەبێت بە سوارچاك، لەم پێناوەشدا دەست بە گەشتێك دەکات کە تێیدا ئەو خاوەن کەسایەتیەکی نوێیە و سوارچاکێکە، بە کورتی: هەوڵی چەسپاندنی ئەو خەیاڵەی دەدات لە واقیعدا.

له فیلمی (Paprika)، کاراکتەری (پاپریکا) خۆی قسەیەکی زۆر جوان دەکات کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ کاراکتەرێکی تر دەکات لە خەوندا، دەڵێت: پێت وانییە ئینتەرنێت و خەون زۆر لەیەك نزیکن؟ هەردووکیان ئەو شوێنەن کە عەقڵی ئاگایی کپکراو تێیدا دەردەبڕدرێت.[٢٦] بەو واتایەی مرۆڤ ئەو شتانەی کە لە واقیعدا ناتوانێت پێی بگات و عەقڵی ئاگایی ڕێی پێنادات، ناچارە لە شوێنێکی وەك خەون و ئینتەرنێت دەریببڕێت. هەر بە هۆی ئەم باسەوە، حەز دەکەم هەر لێرە وتارێکم دابنێم کە لە ٢٠١٢ نووسیومە و تێیدا باسی ئەو چیرۆکەی دۆنکیشۆت و تێکەڵکردنی خەیاڵ لەگەڵ واقیعم کردووە لە سەردەمی نوێدا.

## "سروشتی مرۆڤ و چیرۆکەکەی دۆنکیشۆت"[٢٧]

دۆنکیشۆت یەکێکە لەو چیرۆکە بەناوبانگ و گرنگانەی دونیا کە تیایدا پێناسەیەکی گەورەی یەکێك لە هەست و نەستە گەورە و گرنگەکانی مرۆڤ کراوە. دۆنکیشۆت یان دۆن کیۆتێ، چیرۆکێکی ئیسپانیە لە لایەن (میگوێل دێ سێرڤانتێس) نووسراوە لە سەدەی ١٦دا. باس لە پیاوێك دەکات بە ناوی (ئەلۆنسۆ) خوێنەری زۆرێك لە کتێبە خەیاڵیەکانە ئەو کتێبانەی داستانی سوارچاك و قارەمانەکانی تێدایە و باسی ئازایەتی و بوێری

سوارچاکەکان دەکات بەرامبەر دڕندە و دوژمنەکان. ئەلۆنسۆ لە ژێر کاریگەری ئەو چیرۆکە خەیاڵیانە بڕیار دەدات ژیانی تایبەت بکات بۆ بوون بە سوارچاك تا بەرەنگای دوژمنە دڕندەکان و دێوە زەبەلاحەکان بێتەوە، بەڵام ئایا خەیاڵ دەتوانرێت بهێنرێتە سەر شانۆی ژیانی واقعی؟ مرۆڤ لە ئێستادا و لە کۆمەڵگایەکی دوور لە خزمەتگوزاری گونجاو و نقووم بوونی خەونەکانی و ئەندێشە کردنیان زۆر جار دەکرێ وەك ئەم برادەرەی ئەم چیرۆکەی لێبێت. لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای عێراقی بە گشتی ئەگەری دروستبوونی ئەم جۆرە مرۆڤانە زۆرە کە کاتێك ناتوانن بگەن بە پلەیەك یاخود شتانێك کە حەزیان لێیەتی و پێی ناگەن و ئەستەمە بۆیان، ناچارن بە خەیاڵ بیکێشن بۆخۆیان، ئەوەش مرۆڤ تووشی بەتاڵی دەکات و زۆر جار ناچاری دەکات خۆی ئەم خەیاڵە تێکەڵ بە ژیانی ڕاستەقینەی خۆی بکات.

ئەوەش لە چەند ڕووییکەوە ڕوودەدات، کاتێك سروشتێك لە مرۆڤێکدا نیە جا چ لە شێوەی جەستەیی بێت یان هەر شتێکی تر، هەست بە کەمی دەکات لە چاو ئەو کەسانەی تر کە خاوەنین، وەك ئەوەی بڵێت بۆچی ئەوان دەتوانن وابن و منیش وانیم، بۆچی ئەوان هەست دەکەن خودا پێیانی بەخشیوە و منیش بێ بەشم، ئەم پرسیارانە گشتی وەك گرێیەك لە نەستی کۆدەبنەوە، هەستیش بەو کەم و کورییانە دەکات زۆربەی کاتەکان.

تا لە ئەنجامدا ناچار دەبێت بە شێوەیەکی تر دەری ببڕێت، بە تایبەت لەم کاتەی ئێستادا کە زۆر جیاوازە لەگەڵ سەدەیەك پێش ئێستا. بۆ نموونە،

مرۆڤ لەم سەردەمەی ئێستادا هۆکارگەلێك دەدۆزێتەوە بۆ دەربڕینی ئەوەی لە ناخیەتی و حەزی پێدەکات، بۆ پیشاندانی ئەوەی دەتوانێت بیکات و ئەوەی دەیەوێت بیکات، بۆ نموونە لە کۆندا پێش هەبوونی ئینتەرنێت، مرۆڤ دەیتوانی چ شتێك بدۆزێتەوە بۆ دەربڕینی گشت ئەو شتانەی باسمانکرد؟ هیچ، مەگەر ئەوەی ئەو حەزانەی هەیەتی و ئەو گرێیانەی نەستی بە باسکردن لای هاوسەرەکەی یاخود هاوڕێیەکەی بەتاڵی بکاتەوە، یاخود دەربڕینی بەو کارانەی کە دەیکات، یاخود ئەو شتانەی بەکاری دەهێنێت.

بەڵام لە ئێستادا، زۆر جیاوازە، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئینتەرنێت بەکارهاتووەیەکی گەورەی ئەو پڕۆسەیەن، بە تایبەت فەیسبووك لەم کاتەدا. کاتێك کەسێك حەز بە گەیشتن بە پلەیەك دەکات، یاخود بۆ گەیشتن بەو شێوە هەڵسوکەوتەی کە پێی خۆشە لەگەڵی بکرێت، یاخود بۆ دووبارە دروستکردنەوەی کەسایەتی خۆی، کاتێك ئەو ئامانجانەشی لە هیچدا نادۆزێتەوە، پەنا بۆ جیهانێکی تر دەبات، کە ئەویش جیهانی ئینتەرنێتە بە گشتی. فەیسبووك بە تایبەتی. وەك ئەو قسەیەی کە زۆرێك لە ڕۆژئاواییەکان دەیکەن: (خەڵك دەتوانێت ببێت بە هەر شتێك کە حەزی لێیەتی لە فەیس بووك). وەك ئەوەی کاتێك کەسایەتیەکی نوێ بۆخۆی درووست دەکات، خەڵکانێك دەناسێت کە بەو کەسایەتیەوە لەگەڵی دەجووڵێنەوە دەبن بە نزیکترین هاوڕێی، ئەوەش خاڵێکی تر لە چیرۆکی دۆنکیشۆت نیشان دەدات، کاتێك (ئەلۆنسۆ) لە گەشتەکەیدا بە کەسێك ئاشنا دەبێت بە ناوی (سانچۆ)، پێی دەڵێت تۆ کێیت (ئەلۆنسۆ)ش بە

لوتبەرزیەوە دەڵێ: سوارچاك !، ئیتر سانچۆ لە کوێوە بزانێت (ئەلۆنسۆ) بەدوای خەیاڵەکەی کەوتووە و لە ڕاستیدا جگە لە پیاوێکی خەلەفاو چیتر نییە! (ئەلۆنسۆ)یش کە دەبینێ ئەو بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات، ناچارە بە نزیکترین هاوڕێی خۆی قبوولی بکات، ئەوەی لە جیهانی ئینتەرنێتیش دەیبینین هەمان شتە.

گەر سەرنجتان دابێ، زۆرینەی ئەوانەی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانن، بە تایبەت ئەوانەی لە تەمەنی هەرزەکاری و گەنجین، حەز ناکەن ئەو کەسانە ببیننەوە لەوێ کە پێشتر ناسیویانە یان هاوڕێی کۆنن، یان کەسانێکن بەو کەسایەتیە کۆنەی ئەوەوە سەیری دەکەن. هەندێك کەسی تر هەن، بە لەیەکدانی هەردوو جیهانی خەیاڵی و واقعی ناچارن، ئەوەتا (علی وەردی) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە یەکێك لە میوانخانەکانی بەغدادی ئەوکات، سەرنجم لە گەنجێك دابوو، بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی دەکرد کە یەکێکە لە قۆزترین کوڕەکانی عێراق و وایدەزانی سەرنجی هەموو کچەکانی میوانخانەی لەسەرە. هەر چاوەڕێی ئەوەبوو کچێ بێتە لای و داوەتی بکات کەچی کە شەو درەنگ دەبوو و بە تەنیا دەمایەوە، دەیگوت من زۆر گەورە و کەشخە ترم لەوەی ئەمانەی ئێرە داوا لەمن بکەن لەگەڵیان بم.

ئەم برادەرە بە شێوەیەك وێنەی خۆی کێشاوە کە باشترینی ئەو شوێنەیە، کاتێکیش ئەوەی مەبەستێتی دەستی ناکەوێ، گلەیی لەو کەسانە دەکات کە ناچنە لای، نەك خۆی کە شایەنی نیە. مرۆڤ لەو سروشتەی خۆی

ناکەویَ هیچ کات، تەنها ئەوەی لە سەردەمە جیاوازەکاندا بە شێوەی جیاوازتر دەری دەخات. ئەمەش شتێکە لە گشت مرۆڤێك دایە، بەپێی پلە و پێویستی دەگۆڕێت، یان بە پێی شوێن و کات درووست دەبێت.

## خاڵی دووەم:

## " بە تەکنەلۆژی کردنی خەیاڵ و هەست و خەون "

ئێمە لە سەرەوە زۆر باسی بەکارهێنانی ئامێرمان کرد بۆ مەبەستی گەیشتن بە خەونێکی ئاگایی، لە فیلمەکانیشدا ئەوە زۆر جار باسکراوە و بابەتێکی گرنگ بووە، بەڵام ئایا دەکرێ هیچ مەنتیقێکی زانستی هەبێت؟ یان ئاخۆ لە داهاتوودا شتێکی وا ڕوودەدات؟

باسکردن لە هەستەکانی مرۆڤ بابەتێکی یەکجار ئاڵۆزە لەبەر فرە ڕەهەند بوونی جۆرەکانی هەست کردن و هۆکارەکانیان. بۆ نموونە هەندێك کەس ڕەنگە بە شتێك پێبکەنن یاخود دڵتەنگ بن کە لای هەندێك کەسی تر ئاساییە، بۆیە گەیشتن بە دەستنیشانکردنی هۆکارێکی یەکجار تەواو کارێکی قورسە و زاناکان نەیانتوانیوە پێی بگەن. هەستەکان شتانێکن ناتوانرێت ببینرێن یاخود ببیسترێن، مەگەر بە دیارکەوتنیان لە کەسێکدا ئینجا بزانین، بۆ نموونە تووڕە بوون تا کاردانەوەی لە کەسێکدا نەبینین ناتوانین بزانین کە ئایا بوونی هەیە یاخود نا یاخود کەسەکە بەچی تووڕەدەبێت. بۆیە باسکردن لێی بابەتێکی ئاسان نیە.

زاناكان تا ئەو شوێنە هاتوون كە چەند هۆكارێك بدۆزنەوە بۆ دەستنیشانكردنی هۆكارەكانی ڕوودانی هەستەكان، بۆ نموونە خێرایی لێدانی دڵ نیشانەی ترسە، یاخود بەهۆی ئامێرێكەوە بینینی گرژبوونی چەند خانەیەكی مێشكی مرۆڤ نیشانەی توڕە بوونە. ئەوانە گشتی هەمان شتە لەگەڵ كاردانەوەی هەستەكان لە كەسێكدا، بۆیە زاناكان بۆ نموونە تا ئێستا نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی بتوانن بەهۆی ئامێرێكەوە هەستی مرۆڤەكان بگۆڕن یاخود درووستی بكەن. واتە بۆ نموونە كەسێك بەهۆی ئامێرێكەوە توڕە بكەن، یاخود وای لێبكەن رقی لە كەسێك یان شتێك بێتەوە، هەڵبەتە بە لایەنی بایۆلۆجی و دەرزی و دەستكاریكردنی كۆئەندامی هەستی مرۆڤ، بە تەكنەلۆژی كردنی هەستەكان ناژمێردرێت، چونكە وەك ئەوە وایە كارێك لە جەستەدا درووستبكەی كە كاردانەوەكەی بریتی بێت لە هەستەكان، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە كاریگەری ڕاستەوخۆیە لەسەر هەستەكان بەهۆی ئامێرەوە كە تا ئێستا بوونی نیە.

خەیاڵیش كە شتێكی ونە و تا ڕادەیەكی زۆر لە خەون نزیكە، دەتوانین بڵێین وەك پردێكە لە نێوان خەون و هەستەوە، هەمان شتیش لەسەری جێبەجێ دەبێت. خەیاڵ زیاتر دەدرێتە پاڵ مێشكەوە، مێشك بە درووستكەری دەزانن، بۆیە ئەویش تا ڕادەیەكی زۆر لە هەست نزیكە، بەو پێیەش بێت هەمان شتی لەسەر جێبەجێ دەبێت، خەیاڵ بە ئامێر ناكرێ.

لە ئەنجامی گشت ئەوانەی لە سەرەوە باسمان کرد، گەیشتنی تەکنەلۆژیا بەو ڕادەیەی بتوانرێت ئامێرێك کۆنترۆلی خەون بکات یان درووستکەری خەون بێت کارێکی ئەستەمە و دوورە لە ڕوودانی لە ئێستا و لە داهاتووشدا. ئەگەر ڕۆژێکیش بەڵێن بوو هەنگاوێك لەوە بچینە پێش ئەوە پێویستە لە شتی سەرەتاییتر دەستپێبکەین، خەون زۆر ئاڵۆزترە لە هەست و خەیاڵ، نووسینەکانی سەرەوەش بەڵگەی ئەو ڕاستییەن. ئەگەر ڕۆژێك توانرا هەست بە ئامێر بکرێ یاخود تەنانەت خەیاڵیش بە ئامێر بکرێ، واتە بەهۆی ئامێرەوە کۆنترۆڵ بکرێ یاخود درووست بکرێ، ئەوا ئەو کاتە بیرۆکەکانی فیلمێکی وەك (Inception) بۆ نموونە، دەتوانرێت ببێت بە ڕاستی .

جگە لەوانە، هێشتا زۆر بابەتی تر هەن لە خەوندا کە زۆرێك لە زانایانیش تێیناگەن، بۆ نموونە خەونە هەواڵدارەکان، کاتێك لە خەوندا ڕووداوێك دەبینیت، دوای چەند ڕۆژێك هەمان شت ڕوودەدات کە لە خەونەکەتدا بینیوتە، یاخود لە خەوندا هەواڵی ڕوودانی کارێکت پێ دەدەن، کە لە داهاتوودا دەبێـت بە ڕاستی. لەم جۆرە خەونانە زۆرە، بۆ نموونە لە کتێبی (خەونەکان لە نێوان زانست و بیروباوەڕدا– الاحلام بین العلم والعقیدە)[٢٨]ی عەلی وەردی، چیرۆکێکی لەم شێوەیە باسکراوە، کاتێك ئافرەتێکی ئوستڕالی، لە خەونەکەیدا دەبینێت کە براکەی بە چەقۆیەك خۆی کوشتووە لە کێڵگەکەیان، دوای هەڵسانی لە خەو، داوا لە مێردەکەی

دەكات بچن بە شوێن براكەی، كاتێك دەچن، دەبینێت لە هەمان ئەو شوێنەی كە لە خەوەكەیدا بینیبووی، براكەی كەوتووە و چەقۆیەكی لایە كە نیشانەی خۆكوشتنیەتی. لە كتێبەكەدا چەند نموونەیەكی تریشی تێدایە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا، زانست تا ئێستا نەیتوانیوە پێناسەیەك بۆ ئەم جۆرە خەونانە دابنێت، هەندێك دەڵێن بەهۆی شەپۆلە موگناتیسەكانەوەیە كە لە مرۆڤێكەوە دەچێت بۆ مرۆڤێكی تر، بەڵام ئەوەش هیچ بنەمایەكی نیە. زۆرێكیش ئەوەیان بۆ زیندوو مانەوەی رۆح گەڕاندەوە دوای مردن، واتە ئەو هەواڵانەی پێت دەگات لە ڕێگای خەونەوە بەهۆی رۆحی ئەو كەسانەیە كە مردون و ئاگەداری ئەو ڕووداوەن كە لە داهاتوودا دەبێت. بەڵام ئەوەش وەك ئەوانیتر بنەمای نییە. بەڵام لە لایەنی دینییەوە هەنگاوێكی باشی ناوە، تا ئێستا لە جیهانی ئیسلامی خەون لێكدەرەوەی زۆر باش هەبوونە، (ابن سیرین) بۆ نموونە. یاخود لە مێژووی پێغەمبەراندا، پێغەمبەر (یوسف) كاتێك خەونەكەی فیرعەونی ئەوكات لێكدەداتەوە و داهاتووەكەی پێدەڵێت[٢٩]. لە ئێستاشدا زانایانیی دینی زۆر هەن كە لەم ڕووەوە شارەزان، زۆر جار لە هەواڵدانی خەوندا دەیپێكن، هەندێكجاریش جاریش نا. بەڵام زانست لەم نێوەندەدا هیچ پێشكەوتنێكی نەكردووە، چونكە ئەم بەشەی خەون دەگەڕێتەوە بۆ ریزی ئەو بابەتانەی كە پەیوەندیان بە غەیبەوە هەیە و زانست دەستی پێناگات.

## "ترس له داهاتوو: ترسی مرۆڤ له گۆڕانی بنەماکانی مۆڕاڵ(ئەخلاق) و ترس له تەکنەلۆژیا "

**(چەمکی ترس لەم بەشەدا بەرامبەر چەمکی (فۆبیا) بەکارهاتووە، فۆبیاش به مانای ترسێکی ناعەقلانی و ناتەندرووست و ناڕاست دێت)**

ترس له داهاتوو یەکێك بووە له ترسە هەرە کۆنەکانی مرۆڤایەتی و یەکێك بووە لەو بابەتانەی که باسکردن لێیەوە کارێکی ئاسان نەبووە، چونکە به دوو هۆکاری نادیاری وەك مرۆڤ و ڕووداوەکان بەستراونەتەوە. خۆی له ئەسڵدا مرۆڤ درووستکەری ڕووداوەکانە، بەڵام به جیاکردنەوەی له "ڕووداوەکان" مانای سەربەخۆکردنی ڕووداوە سروشتییەکان(کارەساتە سروشتییەکان) دەگەیەنێت، له کاتێکدا نەزانینی سروشتی مرۆڤ له داهاتوودا هۆکارێکە و نەزانینی کاتی ڕوودانی کارەساتە سروشتییەکان ڕووداوێکی ترە، بۆیە ئەو ئێستایەی تێیدا دەژین، ئەو داهاتووە چاوەڕوان نەکراوەیە که سەد ساڵ بەر له ئێستا پێشبینی نەدەکرا.

داهاتووی زەوی و مرۆڤایەتی له زۆر فیلمدا پێشبینی کراوە و به جۆرێك له جۆرەکان باسکراوە، بۆ نموونە لەو فیلمانەی ئێستا که زۆری باس له کۆتایی هاتنی مرۆڤایەتی و زەوی(Apocalypse) دەکەن، جا

ئایا  بەهۆی بلاوبوونەوەی ڤایرۆسێکی کوشندەیە وەك لە فیلمی ( World War Z ) باسکراوە، یاخود ئایا  بە هۆی تێکچوونێکی تەواوی کەش و هەوای زەویە وەك فیلمی ( The Day After Tomorrow ). لە ئێستادا ئەو جۆرە فیلمانە رەواجێکی زۆریان هەیە و زۆریش لە خەڵکی حەز بە بینینی دەکەن. پێشتر پێشبینی کردنی داهاتووی مرۆڤایەتی تێکەڵبوونی بوو لەگەڵ تەکنەلۆژیا و دروستبوونی رۆبۆت (زیرەکی دەستکرد) وەك لە فیلمی (iRobot ) ئاماژەی پێکراوە. بەو پێیەی زۆربەی پێشبینییەکان وەك بڵێی دەیانگوت "رۆژێك دێت کە مرۆڤ و رۆبۆت لەیەك جیا ناکرێتەوە".

یاخود پێشبینی کردنی داهاتوو بوو وەك لە دەستدانی مۆراڵی مرۆڤ یان خراپ بوونی سروشتی مرۆڤ لە پێناو بەرژەوەندی گشتی وەك لە فیلمی (The Purge ) نیشاندراوە، یانیش بە لاوازبوونی ئاستی بیرکردنەوەی مرۆڤ و بەرەو تەمبەڵبوونی مرۆڤ بەهۆی تەکنەلۆژیاوە وەك لە فیلمی ئەنیمەیشنی (Wall-E ) ئاماژەی پێکراوە.

ئەوانەی سەرەوە گشتی پێشبینی فیلمەکانن کە لە چەند خەیاڵێکی زانستییەوە وەرگیراون، لە هەمان کاتدا ئەوانە گشتی ترسن، پێشبینی کردنیان نیشانەی بوونی ترسە لەوەی رووبدەن.

ئێمە لێرەدا ئەم بابەتە لە بنەمای چەند فیلمێك دەنووسین کە ئەو بیرۆکانەی پێشبینی کراوە تێیاندا دەربارەی داهاتووی ئەخلاقی مرۆڤ و تەکنەلۆژیا لە زۆر ڕووەوە لە واقیع نزیکە و جۆرە بابەتێکی ناوازەی فیکرییە.

## خاڵی یەکەم :

## "ترس لە نەمانی یەکسانی نێوان مرۆڤەکان لە بنەمای کاملبوون(تەواوبوون)"

زۆرێك دەپرسن، دەبێت ڕۆژێك بێت مرۆڤایەتی چیتر بە دەست هەژاری و نەخۆشییەوە نەناڵێنێت؟ دەبێت ڕۆژێك بێت جەنگ بوونی نەمێنێت و شتێك نەمێنێت بە ناوی توندوتیژی لە جیهاندا؟ دەبێت ڕۆژێك بێت هەموو مرۆڤایەتی بە ئاشتی بژی و چیتر توندوتیژی لە بنەمای توندڕەوی ڕەگەز و دینەوە نەمێنێت؟ دەبێت ڕۆژێك بێت مرۆڤایەتی جگە لە خۆشەویستی، شتێك نەبەخشێت بە ناوی ڕق؟ دەبێت ڕۆژێك بێت مرۆڤایەتی خاوەن یەك دینی یەکگرتوو بێت؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە، دەچین سەیری فیلمی ( The Purge) دەکەین، تا بزانین ئایا هیچ خاڵێك لەوانە دەکرێت ڕووبدات لە داهاتوودا، یاخود ئەگەر ڕووش بدات، دوای ئەوە چی دەبێت؟ مرۆڤەکان چۆن هەڵسوکەوت دەکەن؟ مێژوو بەرەو کوێ دەڕوات؟

(The Purge)، یەکێکە لە فیلمە نوێیەکانی ساڵی ٢٠١٣، لە دەرهێنانی (جەیمس دێمۆناکۆ)یە و لە جۆری فیلمی خەیاڵی زانستی و

هەستبزوێنە و یەکێکە لەو فیلمانەی لە کاتی (داهاتوودا) چیرۆکەکەی نوسراوە، واتە باس لە داهاتووی مرۆڤایەتی دەکات، ولاّتێکی وەك ئەمریکاشی بە نموونە هێناوەتەوە. چیرۆکی فیلمەکە بەم شێوەیە :

لە ساڵی ٢٠٢٢ ، ولاّتێکی وەك ئەمریکا گەیشتۆتە ئاستێك کە ڕێژەی دزیکردن و توندوتیژی و بێکاری و هەژاری گەیشتۆتە ئاستێکی وا نزم کە مێژووی مرۆڤایەتی و ئەو ولاّتە تا ئێستا لەو ڕێژە کەمەی بەخۆیەوە نەدیوە، هەموو کەسێك خاوەن خانوو و کاری خۆیەتی، کەس پێویستی بە دزیکردن نیە بۆ بژێوی ژیانی، هیچ شتێك نیە بە ناوی هەژاری، توندوتیژی وا کەم بۆتەوە کە کەس باوەڕی پێ نەماوە و مرۆڤەکان یەکتریان خۆشدەوێت.

(دێمۆناکۆ) لە چاوپێکەوتنێکی دا لەگەڵ وێبسایتی (inquirer.net) باسی فیکرەی فیلمەکە دەکات و دەڵێت: کاتێك لە فەرەنسا بووم، سەیری هەواڵەکانم دەکرد، ئەو توندوتیژیەی دەمبینی لە هەواڵەکان کە بەهۆی کامێرای چاودێریەوە وێنە گیرابوو، وای لێمکرد بیر لەوە بکەمەوە ئاخۆ دەبێت داهاتووی ئەمریکا چۆنبێت لەگەڵ توندوتیژی.[٣٠] دێمۆناکۆ مەبەستی ئەوەیە لە جیهانێکدا کە هەمووشتێك تەندروستە و خەڵکی لە ئاستێکن کە دوورن لە بەیەکداچوونی یەکتر، ئایا دەبێت ڕۆڵی توندوتیژی لە کۆمەڵگایەکی وا چۆن بێت؟

ئەوانە گشتی لە سەرەتای فیلمەکە باس دەکات و پیشان دەدات. کەواتە لە سەرەتای فیلمەکە، وەڵامی گشت ئەو پرسیارانەی سەرەوە دەدرێتەوە بەوەی بەڵێ، ڕۆژێك دێت مرۆڤایەتی هەژاری و بێکاری و توندوتیژی ناهێڵێت و هەموو مرۆڤێك بەیەکەوە بە ئاشتی و ئارامی دەژێت. بەڵام هێشتا وەڵامی چەند پرسیارێکی تر ماوە، ئەوانەش بریتییە لەوەی: دوای ئەوە چی دەبێت ؟ مرۆڤەکان چۆن هەڵسوکەوت دەکەن؟

لەم نێوەندەدا، لە ساڵێکدا، ڕۆژێك دەستنیشانکراوە کە تێیدا ١٢ کاتژمێر، واتە لە کاتژمێر ٨ی شەوەوە تا ٨ی بەیانی. هەموو جۆرە تاوانێك ڕێگاپێدراوە، کوشتنی هەموو کەسێك ڕێگاپێدراوە، بەکارهێنانی هەموو چەکێك ڕێگاپێدراوە (جگە لە موشەك و نارنجۆك و تەقەمەنیەکان). لە ساڵێکدا ١٢ کاتژمێر گشت تاوانێك ڕێگاپێدراوە و هیچ فریاگوزاریەکی خێرایی و نەخۆشخانەیەکیش کار ناکات، لە ساڵێکدا ١٢ کاتژمێر گشت مرۆڤێك بۆی هەیە هەر کەسێك بیەوێت بیکوژێت. وەك لە فیلمەکە ئاماژەی پێکراوە، ئەم ١٢ کاتژمێرە لەم ساڵەدا بەشێکی بۆ پاککردنەوەی وڵاتە لەو جۆرە کەسانە(هەژار، بێ ماڵ)، بەشێکی تری بۆ دەربڕینی ئەو هەستە داخراوەی مرۆڤە لە ناخیدا لەم شەوەدا، بە شێوەیەك ئەگەر کەسێك رقی لە کەسێکی تر بێت یاخود بەخیلی پێببات، یان لە ناخیدا حەز بە کردنی تاوان

بکات بەرامبەری، ئەو شەوە بۆی هەیە ئەوەی لە ناخیدایە دەریببڕێت، جا ئایا  بە کوشتنی ئەو کەسەی تر بێت یاخود لێدانی و ئەتککردنی. ئەوەی سەیرە لە فیلمەکەدا، هیچ بەرهەڵستیەك نابینین لە لایەن خەڵکەوە دژی سیستمی ئەو شەوە. لە دیمەنێکدا (چارلی) کە کوڕی (جەیمس ساندین)ە، لە باوکی دەپرسێت: بۆچی هەموو کەسێك ئەو شەوەی قبوڵە بۆچی کەس نایەوێت ئەو شەوە کۆتایی پێبێت؟. باوکی وەڵامی ناداتەوە، بەڵام وەك لە فیلمەکە ئاماژەی پێکراوە، هۆکاری ڕێکخستنی ئەو شەوە لە ساڵێکدا لە لایەن کەسانێکەوەیە کە هیچ کەسێك بۆی نیە ڕەتی بکاتەوە یاخود بە خراپی بزانێت، جا ئایا  ئەو کەسانە دەسەلاتن یاخود کەسانێکی پیرۆزن ؟ (The Purge) وشەیەکی دینییە، بە مانای پاکبوونەوە یاخود پاککردنەوە دێت .

ئەو پەرەگرافەی سەرەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوە و قسەو باسی زۆر هەیە و لە زۆر ڕەهەندی جیاوازەوە پێناسەی بۆ دەکرێت، وەك ئابوریی، دەروونی ، سروشتی مرۆڤ، ئەوانە چۆن دەبن بە ڕێگاخۆشکەر بۆ گشت تاوانێك کە خەڵکی دەیکات، ئێمە سەرەتا لایەنەکان باس دەکەین و دواتر بۆ هەر یەکێکیان بۆچوونی خۆمان  دەخەینە ڕوو، بەڵام پێش ئەوە با چیرۆکی فیلمەکە بنووسین بۆ ئەوەی لامان ڕوون  و ئاشکرا بێت.

(جەیمس ساندین) پیاوێکی بزنسمانە و درووستکەری سیستمی پاراستنی مالأنە، بۆ ئەوەی خەڵکی لەم شەوەدا بتوانن بەهۆی ئەو سیستمانەوە پارێزگاری لە ماڵ و خۆیان بکان، واتە بۆ ئەوەی خەڵکی لەم شەوەدا پارێزراوبن، پێویستە پەنا ببەنە بەر کڕینی ئەو کەل و پەلانەی (جەیمس ساندین) دایهێناوە. ئەو کچێکی هەیە بە ناوی (زۆیی) کە نزیکەی ١٧ ساڵە، کوڕێکی بچوکیشی هەیە بە ناوی (چارلی)، هاوسەرەکەشی ناوی (ماری)یە، بە بەراورد لەگەڵ دراوسێیەکانیان ئەوان لە هەموویان دەوڵەمەند ترن، لەم شەوەدا توشی هێرشێکی گەورە دەبن لە لایەن خەڵکی ترەوە، لەبەر ئەوەی (چارلی) ئەو شەوە ڕێگا بە کەسێکی ڕەشپێست و بێ ماڵ دەدات بێتە ماڵیان، لە کاتێکدا کۆمەڵە کەسێك بەدوای ئەو ڕەشپێستەوەن و دەیانەوێت بیکوژن وەك کاری پاککردنەوە (The Purge). بۆیە دوو کاتژمێر ماوە دەدەنە جەیمس بۆ ئەوەی ئەو ڕەشپێستەیان پێبدات، ئەگەر وانەکات، ئەوا هەموو خێزانەکەیان دەکوژن. جەیمس بەڵێنیان پێدەدات کە بیدۆزێتەوە و پێیان بدات، کە دەیدۆزێتەوە دەمی دەبەستێت و دەیەوێت بیباتە دەرەوە، بەڵام هاوسەرەکەی و منداڵەکانی پەشیمانی دەکەنەوە، چونکە زۆر دڵنیا بوون لەوەی ئەگەر ئەو ڕەشپێستە ببەنە دەرەوە، ئەوە ئەوان دەیکوژن.

بۆیە (جەیمس) رەشپێستەکە لە ماڵەکەی دەهێڵێتەوە و بە خێزانەکەی دەڵێت: خۆتان ئامادە بکەن ئێستا هێرش دەکەنە سەرمان.

## "لایەنی ئابوریی : لاوازەکان خۆراکن، بەهێزەکان دەیانخۆن"

لە دیمەنێکی فیلمەکە جەیمس وەك سەرکەوتنێك بە خێزانەکەی دەڵێت: پیرۆزباییم لێبکەن، ئەمڕۆ هەموو ئامێرەکانی پاراستنم فرۆشت، ئێستا کۆمپانیاکەمان پێشەنگە.

لێرەدا شتێکی زۆر گرنگمان بۆ دەردەکەوێت، ئەویش بریتییە لەوەی کە لەم نێوەندەدا ئەوانەی ئامێرە پاراستنەکانی کۆمپانیاکەی (جەیمس)یان نەکڕیوە بۆ خانووەکەیان لە ئەگەری هەر هێرشێك لەم شەوەدا، ئەوە پێویستە یان ئەویّ بەجیّ بهێڵن یاخود خۆیان پارێزگاری لە خۆیان بکەن لەم شەوەدا. جا ئەگەر بێتوو هەر خێزانێك توشی هەر هێرشێك بویەوە کە دەکرێتە سەر خانوەکەی بە مەبەستی کوشتنی ئەوان، ئەوە نە پۆلیس بە هانایان دێت نە فریاگوزاری. بۆیە لێرەدا لە نێوان دوو جۆر لە خەڵکی دەوەستین، ئەوانەی کە پارەی دابینکردنی ئامێرەکانی پاراستنیان نیە، ئەوانەشی کە هێندەی ئەوە دەوڵەمەندن بتوانن ئەو ئامێرانە دەستەبەر

بکەن و بیکرپن. ئەوە هیچ شتێکمان بیر ناهێنێتەوە؟ پەندێکی یابانی هەیە دەڵێت: "لاوازەکان خۆراکن و بەهێزەکان دەیانخۆن."[٣١] ئەو پەندە بنەمای لەسەر تیۆری گەشەسەندن(Evolution Theory)ی (چارلس داروین) وەرگرتووە، کاتێك پێی وایە بۆ بەردەوامبوونی ژیان و هۆکاری نەمانی زۆرێك لە توخمەکان بریتییە لە "مانەوە بۆ باشترین یاخود مانەوە بۆ بەهێزترین" بەو واتایەی کە توخمە لاوازەکان بۆیە لەناوچوون، چونکە توانای مانەوەیان نەماوە جا ئاخۆ بەهۆی خواردنی ئەوان بووە لە لایەن توخمە بەهێزەکان یاخود بەرگەنەگرتنی ئەوان بووە لەو بارودۆخەی تێیدا ژیاون.[٣٢] هەرچۆنێك بێت ئەو تیۆرە زۆر رەخنەی زانستی و ئەخلاقی لێگیرا، بۆ نموونە (ئالان کیێس) لە وتارێکیدا کە ساڵی ٢٠٠١ لە ماڵپەری (www.wnd.com) بە ناوی (مانەوە بۆ باشترین؟)بلاًوکراوەتەوە، دەڵێت: ئەو تیۆرە تەنها هۆکارێکە بۆ قۆستنەوەی ستانداردی مۆراڵ(ئەخلاق)، بەوەی بەهێزەکان بتوانن ستانداردەکان دابنێن و لاوازەکانی پێ بچەوسێننەوە.[٣٣]

ئەو تیۆرە تێکەڵبوونی لەگەڵ هەر بابەتێکی تر ناودەنرێت بە (سۆشیال داروینیزم)،سیستمی کاپیتالیزمی(سەرمایەداری) ئەمریکی بۆ نموونە.[٣٤] بەو واتایەی بەهێزەکان لە بواری ئابوریی و کۆمەڵایەتی بۆیان هەیە لاوازەکان بچەوسێننەوە، کێشەکە ئەوکاتە گەورە دەبێت کە لایەنی ئابوریی لەگەڵ تیۆرێکی لەم شێوەیە تێکەڵ دەبێت، کاپیتالیزمی

ئەمریکیش خەریکی هەمان شتە. کاتێك شەقامێکی وەك ( Wall Street) لە شارێکی وەك نیو یۆرکی ئەمریکی، دوو هێندە پارەی هەموو نیو یۆرك بەرهەم دەهێنێت بەهۆی کۆمپانیاکانی ئەو شەقامە و بانکەکانیان.[٢٥] لەوێدا بەهێزەکان دەتوانن خاوەن پارەیەکی زۆر بن و بە جگەرەیەکی سەد دۆلاریەوە بە لای کەسێکی هەژار و بێ ماڵ تێپەڕن و لاشیان ئاسایی بێت. ئەوە لە لایەنی بەرهەمهێنانی ئابوورییەوە، ئەی ئەگەر ئەو ئابوورییە تێکەڵی ژیانی هەژارەکانیش بێت، بە شێوەیەك پێمان بڵێت یان دەوڵەمەند بە، یان ئەگەر هەژار بیت دەبێ بکوژرێی و بمری! بۆیە (دێمۆناکۆ)، زۆر بەجوانی لایەنی ئابوریی تێکەڵ کردووە لەگەڵ ئەو سیستمە کاپیتالیزمەی لە ئەمریکا پەیڕەودەکرێت.

ئەوە لە لایەن خەڵکی هەژارەوە، ئەی دەربارەی ئەوانەی کە پێیان دەوترێ کەسانی بێ ماڵ(Homeless). لە (The Purge) مەبەستێکی گەورەی ئەو شەوە ١٢ کاتژمێرییە بریتییە لە پاککردنەوەی وڵات لەو جۆرە کەسانە(کەسانی بێ ماڵ) بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەمێنێتەوە کە بێ خانوو و ماڵ بێت و هەژار بێت. بە کورتییەکەی : ئەوە چارەسەری نەمانی هەژارییە لە ساڵی ٢٠٢٢، هەژارەکان و بێ ماڵەکان هەموو ساڵێك لە شەوێکدا بکوژە، تا تەنها ئەوانە بمێننەوە کە کەسانی پێگەیشتوو و تێگەیشتوون، ئەوانەی خاوەن خێزانن و خوێندکارن.

بۆیه لەم فیلمەدا، (جەیمس ساندین) نموونەی ئەو دەوڵەمەندەیە کە بەهۆی کۆمپانیاکەی خاوەن پارەیەکی زۆرە، خانووەکەشی وەك خەڵکی دەوڵەمەند خاوەن باشترین جۆری پاراستنە. لە بەرامبەریشدا لە فیلمەکەدا چاومان بە کەسێکی تر دەکەوێت، کەسێکی رەش پێست و بێ ماڵ کە چەند دەوڵەمەندێك(خەڵکانێك) بە شوێنیەوەن بۆ کوشتنی. ئەو کەسە بێ ماڵە نموونەی ئەو خەڵکە هەژارەیە کە لە دونیای ئەمڕۆماندا هەیە. (رۆبێرت هۆگارد) لە وتارێکیدا بە ناوی (ئەمریکا دەتوانێت چی فێربێت دەربارەی (The Purge) ) دەڵێت: ئەو کەسە بێ ماڵە نموونەی ئەو خەڵکەیە کە بە بەراورد بە خەڵکی دەوڵەمەند چەنسیان کەمترە بۆ مانەوە، بەلاّم لە هەمان کاتدا ئەو جۆرە خەڵکەن کە لێیان دراوە، سوکایەتیان پێکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەڕانەوەی مرۆڤایەتی لە دەستی ئەواندا دەبێت.[٣٦]

بەو قسەیەی رۆبێرت بێت، ئەو سیستەمەی بەکارهاتووە لە داهاتوودا (لە فیلمی (The Purge) )، سیستمێکی دوورە لە مرۆڤایەتی، (سۆشیال داروینیزم) و جێەجێکردنی لەگەڵ کاپیتالیزم سیستمێکە تەنها مەگەر بۆخۆی لەسەر خۆی بچەسپێنێت، وەك تیۆرەکەی داروین (مانەوە بۆ باشترین و گونجاوترینە) تەنانەت بۆ ئاژەڵیش جێگای قبوڵ نیە، ئیتر چۆن هاوشێوەی ئەو سیستمە لەسەر مرۆڤ جێبەجێ دەکەن؟

## "لایەنی دەروونی : مرۆڤ خاوەن دەروونێکی حەتمی نیە"

هیچ شتێك نیە بتوانێت دەروونی مرۆڤ لەسەر لایەنێك ڕابگرێت، بەو واتایەی: هیچ مرۆڤێك بۆی نیە تا هەتایە خاوەن دەروونێکی پاك یان خراپ بێت، بەڵکو بۆ بەردەوامبوونی خودی مرۆڤ و بەردەوامبوونی کارکردنی هەستەکانی مرۆڤ پێویستە هاوسەنگ بێت، هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ژیانی تەواو بکات و رقی لە کەس نەبێت، یاخود ژیانی تەواو بکات و تەنها رقی لە دڵ بێت، بەڵکو پێویستە پارێزگاری لە هەردوو لایەن بکات بۆ ئەوەی کەسێکی هەستیار بمێنێتەوە. ئەوەی لە (The Purge) دا دەیبینین، مرۆڤەکان وا دەردەکەون کە هەرگیز رقیان لە کەسێك نەبۆتەوە یاخود هەر هەستێکی نێگەتیڤیان هەبێت بەرامبەر یەکتر، ڕاستە کچەکەی (جەیمس) رقی لە باوکیەتی بەهۆی کوڕە هاوڕێکەی بەڵام ئەو نموونەیە لەسەر ئاستی گشتی هەژمار ناکرێت.

دروستبوونی بەشێکی ئەو ١٢ کاتژمێرە لەم شەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئازادکردنی مرۆڤ لە دەربڕینی هەستەکانی بەرامبەر یەکتر. هەر کەسێك رقی لە کەسێکی ترە، دەتوانێت بیکوژێت، هەر کەسێك بەخیلی بە کەسێکی تر دێت، دەتوانێت لەو شەوەدا تۆڵەی لێبکاتەوە. ئیدی هەر شتێك مرۆڤ لەم ساڵەدا لە ناخیدا شاردبویەوە، بۆی هەیە دەریببڕێت.

لە دیمەنێکدا، (چارلی) کوری (جەیمس) بە دایك و باوکی دەڵێت، بۆ ئەوانیش ناچن بەشداری ئەو شەوە بکەن لە کوشتنی خەڵکی، (جەیمس) دەڵێت: چونکە ئێمە پێویستیمان بەوە نیە کوڕم. (ماری) کە دایکی (چارلی)یە، دەڵێت: تەنها ئەوە بزانە کە ئەو پاککردنەوەیە The Purge کارێکی باشە.

هۆکاری پێویست نەبوونی خێزانی (جەیمس ساندین) ئەوەیە کە ئەوان خێزانێکی تا بڵێی دەوڵەمەند و پێشکەوتوون بە بەراورد لەگەڵ دراوسێکانیان، بۆیە هیچ رق و بەخیلی و هەستێکی تریان نیە کە وایان لێبکات ئەو شەوە بچنە دەرەوە و خەڵکی بکوژن. لە بەرامبەر ئەوەشدا شتێکی زۆر سەیر دەبینین لە سەرەتای فیلمەکە و کۆتاییەکەی، کە پێویستە لێرە ڕوونی بکەینەوە. سەرەتا کاتێك خێزانی (جەیمس) کە ناوی (ماری)یە لە کەلوپەل کڕین دەگەڕێتەوە، لەگەڵ دراوسێکانیاندا زۆر بە ئاسایی قسە دەکەن و وەك بڵێی زۆر یەکتریان خۆشدەوێت ، بەڵام ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، هەمان ئەو دراوسێیانە لە کۆتایی فیلمەکە دەیانەوێت (ماری)و تەواوی خێزانەکەیان بکوژن. گەر بینەر زۆر بە سەرنجەوە سەیر نەکات لەوە تێناگات، (ماری) زۆر دەپاڕێتەوە و داوایان لێدەکات نەیانکوژن لەبەر منداڵەکانیان، پێیان دەڵێت: خۆ ئێوە ئێمە باش دەناسن، ئێوە دراوسێی ئێمەن بۆچی دەتانەوێ بمانکوژن بۆچی؟ یەکێکیان وەلآم

دەداتەوە و دەڵێت: ئێمە لەمێژە جۆرێك لە بەخیلی و رقمان لا درووست بووە بەرامبەر بە ئێوە، بەهۆی ئەوەی  هەموو ڕۆژێك دەبینین ئێوە خەریکی پەیاکردنی پارەی زۆرتر و شتی باشترن لە ئێمە، وەك ئەوەی زۆر لە ئێمە گەورەتر بن، بەڵێ لەبەر ئەوە دەمانەوێت ناخمان پاك بکەینەوە و بتانکوژین.

لەم کاتەدا ئەگەر بەهۆی پیاوە رەشپێستە بێ ماڵەکە نەبوایە، زۆر لەمێژبوو دراوسێکانیان خێزانی (جەیمس)یان کوشتبوو، بەلأم بەهۆی ئەو پیاوەوە رزگاریان دەبێت و دراوسێکانیان دەستبەسەر دەکرێن، بەلأم (ماری) رەتی ئەوە دەکاتەوە کە بیانکوژێت، بۆیە دەوەستێت تا ماوەی ١٢ کاتژمێرەکە تەواودەبێت.

مرۆڤ ناتوانێت خاوەن دەروونێکی حەتمی و نەگۆڕ بێت، بۆیەش ئەوانەی ١٢ کاتژمێری ئەو شەوەیان داناوە لە بنەما و سەرچاوەی ناخ و سروشتی مرۆڤەوە دایانناوە، مرۆڤ ناتوانێت تا هەتایە بەبێ هەستی رق و بەخیلی و هەستە نێگەتیڤەکانی تر بێت، بەشێکی دروستبوونی ئەو ١٢ کاتژمێرە لەبەر دەربڕینی  ئەو هەستە داخراوانەی ناخی مرۆڤەکان بوو.

## "لایەنی سروشتی مرۆڤ: مرۆڤ هەمیشە هەر مرۆڤە"

(ئێدگار ئالان پۆ) نووسەری ئەمریکی دەربارەی سروشتی مرۆڤ دەڵێت: "هیچ باوەڕم بە تەواوبوون(کاملبوون) مرۆڤ نیە، پێموایە ئەو تێکۆشانەی مرۆڤ دەیکات هیچ کاریگەری لەسەر مرۆڤی تر نیە لە داهاتوودا. مرۆڤ لە ئێستادا تەنها چالاکترە، نە دڵخۆشترە، نە زانا ترە لەوەی شەش هەزار ساڵ پێش ئێستا هەبووە"[٣٧]

مەبەستی پۆ، بریتییە لە پیشاندانی سروشتی مرۆڤ، ئەو پێی وایە هەرچەنێك ئێمە هەوڵبدەین و هەرچەنێك ئێمە کار بۆ دروستکردنی خۆشییەکی هەمیشەیی مرۆڤ یاخود زانستێکی هەمیشەیی مرۆڤ بکەین، ئەوە بێ ئەنجام دەبین، چونکە مرۆڤ هەمان ئەو مرۆڤەیە کە هەبووە و دەبێت.

دەگێڕنەوە کاتی خۆی: دوو زانای هاوڕێ هەبوون، بڕیاریاندا ژیانێك بەسەربەرن کە دووربێت لە هەموو ناخۆشیەك و هەموو ئەو شتانەی کە خراپن و تەنها یەکتریان خۆشبوێت و بە ئاشتی ئارامی لەگەڵ یەك بژین، هەردووکیان رازی بوون و لە خەڵکەکەیان دوورکەوتنەوە، تا لە شوێنێك نیشتەجێبوون و دەستیان بەو کارە کرد، نزیکەی هەفتەیەکی برد، بەردەوامبوون، دوای مانگێك کێشەیەك رویدا لە نێوانیان کە وایکرد تەنانەت لە یەکتریش بدەن، کێشەکە لەسەر ئەوەبوو کە ئایا کامیان زۆرتر هاوڕێکەی تری خۆشدەوێت، یەکێکیان دیگوت من زیاتر ئەویتر دەیگوت نا

من زیاتر، نەیانتوانی چیتر بەو شێوەیە بن، کاتێک بۆیان دەرکەوت کە ئەوە دەرچوونە لە سروشتی مرۆڤ، تەنانەت لە ڕێگای خۆشویستنەوە رق درووست دەبێت.

بۆیە مرۆڤ لە نێوان دوو خاڵدا وەستاوە و دەژێت، ئەو دوو خاڵە بریتییە لە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ، ئەگەر خەم و رق و بەخیلی و تەنهایی و هەرچی هەستی نێگەیتڤە بخەینە نێو خاڵە نێگەتیڤەکە و خۆشی و خۆشەویستی و پاکی و پیرۆزی و سۆز و هەستی پۆزەتیڤ بخەینە نێو خاڵە پۆزەتیڤەکە، ئەوکات مرۆڤێک دەتوانێت بەهۆی هەردوو خاڵەوە بژی . بەڵام ئەوەی سەیرە لە مرۆڤدا، هەمیشە لۆژیکێک دەدۆزێتەوە بۆ دەربڕینی ئەو سروشتە خراپەی(نێگەتیڤەی) کە هەیەتی، بۆ نموونە کە رقی لە کەسێک دەبێتەوە، هۆکارێک دەدۆزێتەوە کە دایبپۆشێت و بە شێوەیەک بیکات بە مەنتیقی. لە فیلمی (The Purge) کاتێک لە کۆتاییەکەی (ماری) لە دراوسێکەیان دەپرسێت بۆچی دەیانکوژێت، دراوسێکەیان ئەو رق و بەخیلیەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان(خێزانی جەیمس) لەخۆیان دەرچوون و لە ئێمە دەوڵەمەندتر بوون و خۆیان لە ئێمە بە گەورەتر زانی. ئەوە درۆیەکە کە هەموو مرۆڤێک دەیکات، هەموو مرۆڤێک بۆ داپۆشینی ئەو خاڵە نێگەتیڤەی هەیەتی بەکاری دەهێنێت. بۆیە هەرگیز ئاسان نیە ویستی مرۆڤێک لە ئەنجامدانی کارێک بزانی، سەیرکە (چاک پالأنیەک) ڕۆماننوسی

ئەمریکی لە ڕۆمانی (دڕندە نادیارەکان) دەربارەی ئەوە چی دەڵێت: ئێمە بۆیە لە کەسێك دەپرسین کۆتایی هەفتە چی دەکەی، تا ئەویش لە ئێمە بپرسێت کۆتایی هەفتە چی دەکەین.[38] (چاك) دان بەوە دادەنێت کە مرۆڤ تەنانەت بۆ پرسیارێکی ئەوەندە سادەش مەبەستێکی هەیە لە دواوەی، بۆیە ئاسان نیە ڕاستی هیچ کەسێکمان لە قسەکان و داواکانیەوە بۆ دەربکەوێت.

مرۆڤ لە کۆنەوە سروشتی چۆن بووە هەروا دەبێت، هەموو هەوڵدانێك بۆ دەست بەسەرداگرتنی خاڵێکی مرۆڤ(خاڵی پۆزەتیڤ بۆ نموونە) بە دۆڕان کۆتایی دێت.

لە (The Purge) دا مرۆڤ بۆ کوشتن چەند بیانوویێك دەبینێتەوە، وەك ئەوەی دەڵێت خودا ڕێگای پێداوە، یان بۆ مەبەستی پاککردنەوەی کۆمەڵگایە لەو جۆرە کەسانە، یاخود دەڵێت دەکوژین بۆ ئەوەی ئێمە تەندروست بین.

ئەو بیانووانە گشتی نەفرەتین! گشتی لە دەستدانی ئەخلاقی مرۆڤ بوونە، هیچ شتێك لە مرۆڤ پیرۆزتر و گەورەتر نیە، ئێمە بۆ مرۆڤ دەژین، ئەگەر مرۆڤ نەبێت، هیچ کارێکمان لێرە نییە، ئەگەر مرۆڤ نەبێت لەکێ بپرسین لە کۆتایی هەفتەدا چی دەکەیت؟!

## خاڵی دووەم:

## "ترس لە تەکنەلۆژیا لە بنەمای دەستەوەسانی مرۆڤ لە کارکردنیدا"

ترس لە تەکنەلۆژیا ترسێکی دانەبڕاوی مرۆڤ بووە لەو کاتەوەی ئامێری دروستکرد و بەکاریهێنا وەك یارمەتیدەرێك بۆ کارەکانی و ژیانی ڕۆژانەی. ترس لە تەکنەلۆژیا بابەتێکی نوێ نیە، بەڵکو لە کۆنەوە بوونی هەبووە و قسەی لەسەر کراوە. بۆ نموونە بوونی گروپێك بە ناوی (لەدایت– Luddite) لە سەدەی هەژدە ڕەنگە سەرەتای سەرهەڵدان و دەرکەوتنی ترس لە تەکنەلۆژیا بێت یاخود وەك بە زاراوەی زانستی پێی دەگوترێ (Technophobia)، کاتێك هێرشیان دەکردە سەر ئەو گالیسکانەی هەڵگری جۆرێك لە ئامێر بوون، ئەوان بۆ نموونە دژی هاتنی شەمەندەفەر بوون، چونکە پێیان وابوو مرۆڤ تەمەڵ دەکات بۆ ڕۆیشتن، یاخود دژی ئامێرە کشتوکاڵییەکان بوون چونکە بڕوایان وابوو مرۆڤ لادەدات لەو شێوازە ژیانەی هەیەتی، ئەوان لەگەڵ مانەوەی ڕەسەنایەتی مرۆڤ بوون، باوەڕیان بەوەبوو تەکنەلۆژیای مۆدێرن، مرۆڤەکان لادەدات لە شێوەژیانێکی

سروشتی.[٣٩] ئێستاش ئەو ترسە هێشتا ماوە، بە شێوەی جیا جیا دەردەکەوێت.

لە کاتی ئێستادا، گەیشتوینەتە بەکارهێنانی ئەو تەکنەلۆژیایانەی کە پێشتر باپیرانمان لێی دەترسان، جا لە ڕێگای جیاواز جیاوازەوە، پێشتر باوانمان دژی هاتنی سەتەلایت بوون بۆ لادێکان، چونکە پێیان وابوو گەیشتنی ئەو ئامێرە، خەڵکەکە بەرەو دوورە دین و نەمانی ڕەوشت دەبات، بەڵام ئا ئەوەتا ئێستا چەندین هۆکاری گەورەتر هەن لە تەنها سەتەلایتێك، خەڵکیش نە بەرەو دوورە دین ڕۆشتوون و نە لە ڕەوشتیس لایانداوە. بۆیە دەکرێ بڵێین زۆرێك لەو ترسەی کە لە تەکنەلۆژیای مۆدێرن هەیە، ترسێکی (فۆبیاییە) بەو واتایەی مەنتیقێکی عاقلانی و هۆکارباری نیە، بەڵکو ترسێکی دەروونی و ناتەندرووستە. بۆیە دەکرێ بڵێین تا ڕادەیەکی زۆر ئەو ترسەی لە لایەن گروپی (لەدایت) هەبوو، هەمان ترسە کە باپیرانمان هەیانبوو، هەردووکیان سەرچاوەیان لەوە گرتووە کە ئێمە بەهۆی تەکنەلۆژیای سەردەمەوە تەمەڵ دەبین یاخود لەسەر رەسەنایەتی خۆمان نامێنین. بەڵام ئەوەتا هەمووی ڕوویدا، چونکە ئەوان نەیانتوانی ڕێگری لێبکەن، ئێستا ئێمە لەسەر ڕەسەنایەتی باپیرانمان نین لە ڕووی کارکردنەوە، ئێمە شارستانی ترین لەوان، ئێمە خاوەن چەندەها جۆری

تەکنەلۆژیای سەردەمین، ئێمە باشترین هۆکارەکانی گواستنەوە بەکاردەهێنین بۆ ئەوەی کەمترین ماندوبونمان هەبێت، ئێمە جلێك دەپۆشین کە ئەوان هەرگیز بیریان لێنەکردۆتەوە. لەگەڵ بوونی ئەو هەموو ترسە لە کۆندا، هەر گەیشتین بەو تەکنەلۆژیایە و بە خۆشحاڵیشەوە بەکاریدەهێنین ئەگەر بێتوو زەرەرمەندیش بوبین تێیدا. ئەوانە گشتی بە شێوەیەکی تاریکییانە دەیانەوێت پێمان بڵێن، ئەو ترسەی لە ئێستادا هەتانە لە تەکنەلۆژیای داهاتوو، پێی دەگەن و ناتوانن بیوەستێنن. بەڵام ئایا ترسەکانمان چییە لە ئێستادا؟ بۆچی درووست بوون؟ ئایا پێی دەگەین یان نا؟مرۆڤ لە ئێستادا، چەند ترسێکی گەورەی هەیە بەرامبەر بە تەکنەلۆژیای داهاتوو، کە بریتین لە: ترس لە نەمان و لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی خەریك بوون بە ئامێرەکان، ترس لە زۆربوونی ئامێرە یارمەتیدەرەکان بە شێوەیەك کە هیچ کارێك بۆخۆمان نەکەین بەڵکو بۆمان بکەن، ترس لە دروستبوونی ڕۆبۆت و زیرەکیی دەستکرد "Artificial Intelligence"، ترس لە دروستبوونی تەکنەلۆژیایەکی دژە–مرۆڤی. ئەو خاڵانە گشتی بە ڕەچاوکردنی کات دامانناوە، واتە نزیکترین ترس لە ئێستادا چ ترسێکە. ئێستاش خاڵ بە خاڵ باسی هەموویان دەکەین و هۆکار و سەرچاوەی ترسەکان دەخەینەڕوو.

## "ترس لە نەمانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان: ترسی مۆدێرن لە تەکنەلۆژیا"

لە سەرەتای سەدەی بیستەوە، دوای گەڕانەوەی مرۆڤەکان لە هەردوو جەنگی جیهانیەوە بۆماڵەوە و گرنگیدان بە ژیانی ڕۆژانە و پەروەردەکردنی منداڵ و هەڵبژاردن و کڕینی باشترین شت بۆ خۆیان و منداڵەکانیان بووەتە ئامانجی ژیانیان. چۆن وابکەن باشترین بژین و خۆشبەختترین کەس بن، ئەوانە خەمی مۆدێرنەی مرۆڤە. لە لایەکی ترەوە گرنگیدان بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان یەکێکیتر بووە لەو خاڵانەی گرنگیپێدان پێی وەك پێویستی و ئەرکێك وابووە. بۆیە دەتوانین بڵێین ترس لە نەمانی ئەو پەیوەندییەش سەرەتای ترس بووە لە تەکنەلۆژیا، سەرەتا کەسانێك پێیان وابوو بە هاتنی تەلەفۆن خەڵکی چیتر گرنگی بە هات و چۆ و سەردانکردنی خزمان نادات، بەڵام ئەوەتا تەلەفۆن هات و سەردانیکردنی هاوڕێ و خزمانیش هەر بەردەوامە، ئەگەرچی کەمیشی کردووە. بۆیە ئێستا ترسەکە بەڕادەیەك گۆڕاوە بە ئومێدێك و دەیەوێت بڵێت کە بە زیاتر بەرەوپێشچوونی تەکنەلۆژیایی "پەیوەندیکردن" پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان فراوانتر و گەشەسەندوو تر دەبن، تا ئەوکاتەی گەیشتینە

ئەو سەردەمەی هۆکارەکانی پەیوەندیکردنی وەك : فەیسبووك، ئیمەیل، تویتەر، ...هتد ڕۆژانە لەگەڵمان دەژین، بۆیەش کاریگەری لەسەر پەیوەندی کۆمەلآیەتی هەبووە، چونکە لەو شوێنانەشدا هاوڕێ و خزمەکانمان دەتوانن دەربارەی ئێمە و نوێترین ڕووداوەکانی ژیانمان بزانن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ترسەی کە هەیە لە ئێستادا، بریتییە لە ترسی نەمانی ڕەسەنایەتی پەیوەندی کۆمەلآیەتی، بە شێوەیەك ئەو جۆرە ئاکارانەی لە نێوان خزم و هاوڕێکان هەبوو لە ڕابردوودا ئێستا بەرەو نەمان دەچێت، واتە: کاتی خۆی بۆ هەواڵزانینی هاوڕێکەت سەردانیماڵیانت دەکرد، بەلآم ئێستا بەهۆی تەکنەلۆژیاوە لە "ئینتەرنێت" دەتوانی لێی بپرسی، پێشتر بۆ پیرۆزباییکردن لە هاوڕێکەت یاخود هاوخەمی دەربڕینت بۆی سەردانت دەکرد، بەلآم ئێستا بە پەیامێکی نوسراو ئەوە دەکەی، ترسەکە لەوەدایە کە گشت ئەو ڕەسەنایەتیەی لە پەیوەندییە کۆمەلآیەتییەکاندا هەیە، بەرەو "نووسراو بوون" دەڕوات. بەو واتایەی کە مرۆڤ ئەو ڕەسەنایەتییە بگۆڕێتەوە بەو شێوە تازەیەی کە تەکنەلۆژیای مۆدێرن پێشکەشی کردووە. ئەگەر لە ئێستاشدا ئەو پەیوەندییە کۆمەلآیەتییە بە شێوەیەك مابێت، ئەوە دوور نیە لە داهاتوودا بەرەو شێوەی "نووسراو بوون" بڕوات.

مرۆڤ لە ئێستادا غەمباری دروستبوونی ئەو سەردەمەیە، ڕەنگە ئەو غەمە سودی نەبێت، چونکە غەمی باوانمان زۆر لەوە گەورەتر بوو کەچی هەر پێشی گەیشتین. بەرامبەر ئەو ترسە دەتوانین بڵێین کە ئەوە ترسی نەمانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نیە، بەڵکو ترسی نەمانی ڕەسەنایەتی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە، بە مانەوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئینتەرنێت هەم سوودێك دەگەیەنێت کاتێك پەیوەندیکردن و هەواڵپرسینی دۆستان و خزمان ئاسان دەکات، هەم شتێکیشمان لێ دەسەنێت کە بریتییە لە نەمانی رەسەنایەتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی وەك سەردانیکردن و شێوازە ڕەسەنەکانی تری پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

## "ترس لە زۆربوونی ئامێرە یارمەتیدەرەکانی مرۆڤ: نموونەیەکی "داهاتوو" لە فیلمی (Wall-E)ەوە "

ئامێرە یارمەتیدەرەکان وەك لە سەرەتادا باسمان کرد، یەکەمینی ئەو تەکنەلۆژیایە بوون کە دژایەتیان کرا و ترسی تەکنەلۆژیا لێیانەوە دروستبوو، بۆیە دووەمین ترسە لە تەکنەلۆژیا لە دوای ترس لە نەمانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. دوورنیە ئەو ترسە گەشەبکات دوای دە یان بیست ساڵێکی تر. بەڵام هەست ناکەن کە لە ئێستاشدا هەنگاوێکی زۆر باشی بڕیوە؟ ترس لەو ئامێرانە لە بنەمای نەمانی توانای سروشتی مرۆڤە، لە بنەمای ئەوەی مرۆڤ خاڵی بێتەوە لە کارکردن و وەرزشیی بوون، یان ترسە لە بە پێویست نەمانی هێزی بازووی مرۆڤ. سەیربکە لە ئێستادا چ هەنگاوێکی ناوە، دە ساڵێك بەر لە ئێستا کارێکی ئاسایی ڕۆژانەی وەك قاپ شتن بە دەست و بازوو دەکرا، بەڵام لەمڕۆدا بەهۆی بوونی ئامێرەکەوە ئەنجامدەدرێت، تا وای لێهاتووە کارەکانی ماڵەوەی ئافرەت پێویستی بە خودی خۆی نەماوە. ئەوەش لە داهاتوودا زیاتر دەبێت، بۆ نموونە : تەکنەلۆژیایەکی بچوکی وەك "Voice Command- فەرمانی دەنگی" کاریگەرە لەسەر کەمکردنەوەی جوڵەی مرۆڤ، بهێنە پێش چاوت

تەلەڤزیۆنەکەت چیتر بە کۆنترۆڵ داناگیرسێنی، بەڵکو تەنها بە وتنی وشەی "دابگیرسێ" کارەکەت جێبەجێ دەبێت، ئەوە نموونەیەکی بچوکە کە دواتر شتی گەورەتری لەدوا دێت. یان بهێنە پێش چاوت لە داهاتوودا ئۆتۆمبێلیش بە هەمان شێوە کاربکات، ئەوکات دەبێت چ ئەزیەتێك بمێنێت بیکێشین.

مرۆڤ بە لایەك پێی خۆشە ڕۆژێکی وا ببینێت، کێ هەیە ویستی کڕینی سەیارییەکی نەبێت کە بە فەرمانی دەنگی کار بکات؟ هەمومان پێمانخۆشە و حەزدەکەین، لە هەمان کاتدا ترسێکمان هەیە لەوەی ئەو تەکنەلۆژیایە کەسانێکی تەمبەڵمان لێ دروستبکات.

(Wall-E)، فیلمێکی ئەنیمەیشنە لە ساڵی ۲۰۰۸ لە لایەن (ئەندرێو ستانتۆن)ەوە دەرهێنراوە و کۆمپانیای (پیکسەر) بەرهەمی هێناوە، لەم فیلمەدا ترس لە زۆربوونی ئامێرە یارمەتیدەرەکانی مرۆڤ بەڕوونی دیارە. کاتێك باس لە داهاتوویەکی دووری مرۆڤایەتی دەکات، کە بەهۆی پیسبوونی ژینگەی زەوی، لەناو کەشتییەکی ئاسمانیەوە ژیان بەسەردەبەن، بەڵام چ ژیانێك، مرۆڤەکان پاڵکەوتوون لەسەر کورسیەك بە درێژایی ئەو ڕۆژەیان و شەوانە بە یارمەتی ئامێرەکان دەچنەوە سەر جێگای خەوتنیان و کە بەیانیان هەڵدەستنەوە، دووبارە لەسەر ئەو کورسیە دەبن. نان دەخۆن و یاری دەکەن لەسەری، بەهۆی بوونی شاشەیەکی

ئەلیکترۆنی لەسەر کورسیەکە، پەیوەندی بە یەکتر دەکەن و قسە لەگەڵ یەکتری دەکەن. ژیانیان بەو شێوەیە بەردەوام بووە تا چەندها ساڵ کە دیار نیە و لە فیلمەکە باس نەکراوە، بە هەر شێوەیەك بێت ئەوان ژیانیان بەو شێوەیە بەردەوام بووە، تا وایان لێهاتووە کێشی لەشیان بە شێوەیەکی گشتی بەرزبۆتەوە و لە کێشی ئاسایی مرۆڤ لایانداوە. هەر لەبەر ئەوەش بە ئەستەم دەتوانن لەسەر قاچی خۆیان بوەستن، ڕۆبۆتەکان یارمەتییان دەدەن و ئامێرەکانیش هەروەها. تەنانەت گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە منداڵەکانیان خۆیان پەروەردەیان ناکەن، بەڵکو چەند ڕۆبۆتێك وانەیان پێدەڵێن و پەروەردەیان دەکەن. ئەوەش کاریگەریەکی گەورەی تەکنەلۆژیا پیشان دەدات لەسەر مرۆڤ لە داهاتوودا.

ئەگەرچی (Wall-E) فیلمێکی ئەنیمەیشنی کۆمیدی و ڕۆمانسییە، بەڵام لە دواوەیدا ئەو ترسە گەورەیەی لە تەکنەلۆژیا هەڵگرتووە، بۆیە دەرهێنەر دەیەوێت پێمان بڵێت کە ئەوە تەنها نموونەیەکە لەو تەکنەلۆژیایەی پێمان دەگات لە داهاتوودا، چ لە ناو کەشتیەکی ئاسمانی و چ لەسەر زەوی بین، ڕۆژێك دێت بەهۆی ئامێرە یارمەتیدەرەکان ئێمە هەم مرۆڤانێکی تەمەڵ و هەم مرۆڤانێکی ناهۆشیارمان لێدەرچێت.

له فیلمەکەدا باس لە ڕۆبۆتێك دەکات بە ناوی (Wall-E) کە دەبێتە هۆکاری ڕزگاربوونی مرۆڤایەتی لەو نەزانینە و گەڕانەوەیان بۆ سەر زەوی. لە دیمەنێکدا کاتێك ڕۆبۆت ەکە خۆی دەکێشێت بە یەکێك لەو کەسانەی ناو کەشتیە ئاسمانیەکە، لەسەر کورسیەکەی بەردەبێتەوە و شاشەکەی بەرامبەری نامێنێت و ناو کەشتیەکە دەبینێت، کە بۆ یەکەمجارە تەرکیز بخاتە سەری و زۆر سەرسام دەبێت بە دیمەنەکە، وەك ئەوەی یەکەم جاری بێت بینیبێتی لە کاتێکدا تەواوی تەمەنی لە ناویدا ژیاوە. ئەو دیمەنە نا هۆشیاری تەواو پێشان دەدات لە لایەن مرۆڤەوە لەو کاتەدا بەهۆی زۆربوونی ئامێرە یارمەتیدەرەکانیان.

بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو ترسەی کە لە دە ساڵی داهاتوودا گەورەتر دەبێت، بریتییە لە ترسی زۆربوونی ئامێرە یارمەتیدەرەکانی مرۆڤ، کە ئەگەر بێتوو جوڵەی مرۆڤ بەهۆیانەوە بە ڕێژەیەکی بەرز کەمبێتەوە، ئەوا قەڵەوی و تەمەڵی بە ڕێژەیەکی زۆر زیاد دەکات. لە ئەنجامیشدا هەم هۆشیاری مرۆڤ بەرەو لاوازبوون دەڕوات، هەم مرۆڤێك بەرهەم دێت کە تەکنەلۆژیا کولتوریەتی.

## "ترس له ڕۆبۆت : ترسی داهاتووی مرۆڤ له تەکنەلۆژیا"

ترسی داهاتووی مرۆڤ له تەکنەلۆژیا بریتی دەبێت له ترسان له دروستبوونی ڕۆبۆت، یاخود پەیابوونی ڕۆبۆت. ئەگەرچی ئەو ترسه له ئێستادا باسێکی گەوره نییه بەڵام له داهاتوودا یەکێك دەبێت له ترسه گەورەکانی مرۆڤ، له فەرهەنگی زانستی پێی دەوترێ (Robophobia ) یاخود (Grimwade' Syndrome)، کاتێك مرۆڤ ترسی تێکەڵبوونی مرۆڤ لەگەڵ ڕۆبۆتی دەبێت یاخود ترس له دڕندەبوونی ڕۆبۆتی لا دروست دەبێت. ترس له ڕۆبۆت بابەتێکه له زۆر لایەنەوه بوونی هەیه، لەوەی ئەگەری هەیه له داهاتوودا شوێنی مرۆڤ بگرێتەوه له چەند ڕوویێکەوه وەك: کارکردنی له جیاتی مرۆڤ، خزمەتکردن له جیاتی مرۆڤ، شوێنگرتنەوەی مرۆڤ له پەیوەندی سێکسییدا. له لایەکی ترەوه ترس له هێرشکردنی ڕۆبۆت بۆ سەر مرۆڤ هەیه لەوەی که ڕەنگه به شێوەیەك کۆنترۆڵ بکرێ و دژی مرۆڤ بەکاربهێنرێت.

١- کارکردن له جیاتی مرۆڤ: له ئێستادا دروستکردنی ڕۆبۆت له شێوەی مرۆڤ تا ڕادەیەکی باش پێشکەوتوو بووه له شێوەدا، بەڵام له ڕووی کارکردن و جوڵەوه هێشتا نەگەیشتۆته ئەو ئاستەی له مرۆڤێکی تەواو بچێت. له زمانی زانستیدا (Humanoid robot) بەکاردەهێنرێت، به واتای ڕۆبۆتی له مرۆڤ چوو. له ساڵی ٢٠٠٩ ، چەند نموونەیەك لەم ڕۆبۆتانه

له پێشانگای جیهانی ڕۆبۆت پێشاندران له تۆکیۆ، که زۆرێك له ڕۆبۆته‌کان پێشکه‌وتنێکی به‌رچاویان به‌خۆوه بینیبوو له جوڵه و شێوه‌یاندا.[٤٠] ئه‌وه‌ش کاریگه‌ری له‌سه‌ر کارکردنی ڕۆبۆت ده‌بێت له شوێنی مرۆڤ، چونکه له ئێستادا ولاَتێکی وه‌ك یابان کار له‌سه‌ر فره جوڵه‌ی ڕۆبۆت ده‌کات بۆ کارکردن، به شێوه‌یه‌ك بچێته بازاره‌کان و خه‌ڵکی بیکرێت. ترسه‌که لێره‌دا پێشکه‌وتوو بوونی ڕۆبۆته به شێوه‌یه‌ك بتوانێت کاره‌کانی مرۆڤ بکات له داهاتوودا. بۆ نموونه گه‌ر له ئێستادا توانای پاککردنه‌وه‌ی ماڵی هه‌بێت، دوورنیه له داهاتوودا توانای کاری تریشی هه‌بێت، بۆ نموونه ئه‌و کارانه‌ی که مرۆڤ له ئێستاماندا به‌هۆی بڕوانامه و خوێندنه‌وه پێی ده‌کات، بۆی هه‌یه له داهاتوودا ببێت به مامۆستا له خوێندنگاکان، یاخود ببێت به ئه‌ندازیار، ئا ئه‌وکاته شوێنی مرۆڤ ده‌گرێته‌وه له کارکردنیدا. وه‌ك له فیلمی (Wall-E) باسمانکرد که ڕۆبۆت په‌روه‌رده و وانه‌یان به منداڵه‌کان ده‌وته‌وه له جیاتی مامۆستا و دایك و باوکیان.

٢- خزمه‌تکردن له جیاتی مرۆڤ: ده‌توانین بڵێین ئه‌و خاڵه‌یان له ئێستادا قۆناغێکی باشی بڕیوه، دوور نیه پاش چه‌ند ساڵێکی تر بوونی ڕۆبۆت له بازاره‌کان شتێکی ئاسایی بێت. ڕۆبۆتێك بتوانێت خواردن ئاماده بکات، یه‌کێکیتر بتوانێت ماڵ پاك بکاته‌وه، یان یه‌کێکیتر ئاگه‌داری منداڵه‌کانمان بێت، ئه‌وانه گشتی دوورنیه ڕووبدات، ئه‌وکاته‌ش ڕۆبۆت زۆرێك له کاره‌کانی مرۆڤ که‌م ده‌کاته‌وه و خزمه‌تی مرۆڤ ده‌کات.

٣- ڕۆبۆتی سێکس: یەکێك لەو باسانەی دەربارەی ڕۆبۆت زۆر بلاّوە و کاری بۆ کراوە لە لایەن ولاّتانی ئەمریکا و یابان، بریتییە لە دروستکردنی ڕۆبۆت لە شێوەی مرۆڤدا بە چەند تایبەتمەندیەك کە لە مرۆڤ بچێت لە ڕووی جەستەییەوە. ئەو جۆرە ڕۆبۆتە مێژووەکی کۆنی هەیە، بە زیاتر پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، قۆناغی زیاتری بڕیوە و تایبەتمەندی زیاتری بۆ دانراوە. لەم کۆمپانیانەش، کۆمپانیای (Orient Industry)ی یابانیە.[١] هەرچۆنێك بێت دروستکەری ئەو ڕۆبۆتانە هۆکاری دروستکردنیان دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ زۆر جار دەکرێ سەرقاڵ بێت یاخود لاواز بێت لە پەیوەندی بە کەسانی ترەوە، بۆیە باشترە بۆی پەنا بۆ ڕۆبۆتێك ببات لەوەی بۆ مرۆڤێك. من دڵنیام هەرگیز بەو شێوەیە ناڕوات کە ئەوان هۆکاری دروستکردنی بۆ دەگەڕێننەوە، بەڵکو بگرە هەڕەشەیەك دەبێت بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە. ئەو بیانووانەش وەك هەر بیانووەکی تر، بێ بنەمایە . کێشەکە لە یاسایی بوونی فرۆشتنیەتی، ترسەکەش لێرەوە دەست پێدەکات، ئایا ئەگەر بێتوو دوای چەند ساڵێکی تر بەهۆی پێشکەوتنی زیاتری تەکنەلۆژیاوە ئەو ڕۆبۆتانەش پێشکەوتن، ڕێژەی کەم بوونەوەی هاوسەرگیری و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان کەم ناکات؟

٤- ترس لە جەنگی ڕۆبۆت: فیلمی (i, Robot ) لە دەرهێنانی (ئەلێکس پرۆیاس) و لە ساڵی ٢٠٠٤، باس لە داهاتوویێك دەکات کە ڕۆبۆتەکان تێیتدا بە شێوەیەکی فراوان پێشکەوتوون و یارمەتیدەری مرۆڤن لە کارەکانیان،

هەرماڵێك ڕۆبۆتێكی تێدایە، هەر كۆمپانیایەك چەندەها ڕۆبۆت. (ئیسحاق ئەسیمۆڤ) نووسەری (i, Robot ) لە ساڵی ١٩٥٠ ڕۆمانەكەی بە چاپ گەیاندووە، واتە ئەو زیاتر لە نیو سەدە بەر لە ئێستا پێشبینی هاتنی داهاتوویەكی كردووە كە تێیدا ڕۆبۆتەكان لە گشت شوێنێكن، لە گشت ماڵێكن.[٤٢] لە وتەیەكیدا هەر لە كتێبەكەی (ئیسحاق) باس لەو ڕۆبۆتانە دەكات و دەڵێت: تۆ هەرچۆنێك بێت ناتوانی جیاوازی لە نێوان مرۆڤێك و ڕۆبۆتێك بكەی . واتە دەكرێ ڕۆبۆتەكان ئەوەندە پێشبكەون كە جیاكردنەوەیان لە مرۆڤ كارێكی ئاسان نەبێت. هەرچۆنێك بێت، بە تێكچوونی سیستمی ڕۆبۆتەكان، وایان لێدێت هێرش دەكەنە سەر مرۆڤ و دەیانكوژن. ئەو فیلمە یەكێك لە ترسەكانی مرۆڤ پیشان دەدات لە ڕۆبۆت.

## "ترس لە تەكنەلۆژیای دژە-مرۆڤ: ترسێك لە نێوان خەیاڵ و داهاتوویەكی دوور"

ترس لە تەكنەلۆژیای دژە-مرۆڤ بریتییە لە ترسی دروستبوونی تەكنەلۆژیایەكی "ئاقڵ" كە بتوانێت خۆی بیربكاتەوە و خۆی بڕیار بدات (تەكنەلۆژیای زیرەكیی دەستكرد). تەكنەلۆژیایەك كە هیچ جیاوازیەكی نەبێت لەگەڵ مێشكی مرۆڤ. ئەوكاتە بەهۆی بیركردنەوەكانی لەناوبردنی

مرۆڤ بە پێویست دەزانێت و کاری بۆ دەکات. ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لە تەکنەلۆژیای داهاتوو لە زۆر فیلمدا ڕەنگ دەداتەوە، کە بریتییە لەو کاتەی مرۆڤ گشت قۆناغەکانی بەرەو پێشبردنی تەکنەلۆژیای تەواوکردووە و گەیشتۆتە ئەو ئاستەی بتوانێت شتێك درووست بکات لە خۆی بچێت و وەك خۆی خاوەن عەقڵ بێت.

زۆرێکمان گوێمان لە فیلمی بەناوبانگی (The Terminator) بووە، ئەو فیلمە نموونەیەکی زەقی ئەو داهاتووەیە کە مرۆڤ لێی دەترسێت لەگەڵ ئەوەی هەنگاویشی بۆ دەنێت.

(The Terminator : Salvation) بەشێکی نوێی ئەو فیلمەیە کە لە ساڵی ٢٠٠٩ دەرهێنراوە، باس لە دروستبوونی تەکنەلۆژیایەکی بەهێز و ئاقڵ دەکات بە ناوی (SkyNet) کە هەوڵ بۆ نەمانی مرۆڤ دەدات و لەم پێناوەشدا چەندین کارگەی تایبەت بە درووستکردنی ئامێری مرۆڤ–کوژ ی داناوە کە لە شێوەی ڕۆبۆت و پیاوی ئاسنین. لەگەڵ لەناوچوونی بەشێکی زۆری مرۆڤایەتی بەهۆی ئەوانەوە، لە کۆتاییدا ئەو کۆمەڵە مرۆڤەی ماونەتەوە ئەو تەکنەلۆژیایە لەناودەبەن و دووبارە ئومێدێك دەبەخشنەوە بە مرۆڤایەتی.

باسکردن لە تەکنەلۆژیایەکی لەم جۆرە، دەکرێ هەم لۆجیکێکی هەبێت و دەشکرێ هەر خەیاڵێکی زانستی بێ و بەس، مرۆڤ لە ئێستادا کار لەسەر دامەزراندنی فەرمانە ئەلیکترۆنەکانی دەکات لەسەر ڕۆبۆت دا. لە داهاتووشدا کار لەسەر دروستکردنی سۆز و عاتیفە دەکات تێیدا، دوای ئەوە کار لەسەر دروستکردنی "عەقڵ" دەکات لە ڕۆبۆتتدا، بۆیە تا ئەوکاتەی بتوانێت هەست لە ڕۆبۆت دا جێگیر بکات ئەوە عەقڵ کێشە نابێت. بەڵام ئەوەی ئێمە زۆر لە فیلمەکاندا دەیبینین ڕۆبۆتەکان خاوەن عەقڵن، بەڵام خاوەن سۆز و بەزەیی نین. بۆیە دەکرێ بڵێین دانانی عەقڵ ئاسانترە لە هەست؟ بێگومان نەخێر، هەستەکان لەگەڵ ئەو ئاڵۆزیەی هەیانە، هێشتا جێگیرکردنی عەقڵ لە ڕۆبۆت دا ئەستەمترە. مەبەستی گشتی ئەو فیلمە بریتییە لەوەی ڕۆبۆتەکان بۆیە مرۆڤەکان دەکوژن، چونکە عەقڵیان هەیە تا بیر لەوە بکەنەوە بیانکوژن و هەستیشیان نییە تا بەزەییان پێدا بێتەوە. بەڵام ئەگەر بەو لۆجیکە بێت، ئەوە ئەو بابەتە وەك خەیاڵێکی زانستی بهێڵینەوە باشترە، چونکە دروستکردنی عەقڵ زۆر ئەستەمترە لە دروستکردنی هەست، لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان شتانێکی نادیارن، مادەیەك نین بە خستنە سەر ڕۆبۆتەکان کاربکەن، بۆیە ئەو ترسە تا ڕادەیەکی زۆر تەنها لە بازنەی خەیاڵێکی زانستی دەمێنێتەوە.

## "مۆراڵ(ئەخلاق) جێگرەوەی ئەقڵ بۆ پاراستنی مرۆڤایەتی و مرۆڤبوون"

ئەوەندەی تێبینیم کردبێ تا ئێستا زۆر بە کەمی باسی ئەم بابەتە کراوە و زۆر کەم کتێبی لەسەر نوسراوە، هەڵبەتە مەبەستم ئەخلاقە. تاکە کتێبێك بینیبێتم بە کوردی لە بارەوەی کتێبی (ئەخلاقناسی)ی (تەحسین حەمەغەریب)بووە کە لە ڕووێکی فەلسەفیەوە باسی لێوە کردووە و جۆرەکان ئەخلاق و بۆچوونەکانی فەیلەسوفانی تێدا باس کردووە.[٤٣] کتێبێکی زۆر بەسوودە بۆ ناسینی ئەخلاق هەم لە ڕووە فەلسەفیەکەی هەم بە واتایەکی گشتی، بەڵام تەنها ئەوەیە کە ئەو زۆر بابەتی لە بنەمای لۆژیکی کۆن لێکداوەتەوە. ئەوەی ئێمە لێرەدا باسی دەکەین، خوێندنەوەیەکی جیاوازە کە لە سێ خاڵدا کۆی دەکەینەوە، یەکەم بریتییە لە گرنگی ئەخلاق بۆ مرۆڤایەتی، دووەم، لە ئەگەری نەمانی ئەخلاقدا، سێیەم، بەدیل بوونی ئەخلاق بۆ پاراستنی مرۆڤ و جیاکردنەوەی لە بونەوەرەکانی تردا، ئەو خاڵانەش وەك زۆربەی بابەتەکانی تر لە چەند نموونەیەکی فیلم باس دەکەین.

هەڵبەتە ئەم بابەتە زیاتر وەڵامێکە بۆ ئەوانەی جیاوازبوونی مرۆڤ لە بوونەوەرانی تر تەنها لە "عەقڵ"دا کۆدەکەنەوە، کە کۆمەڵێ فەیلەسوف و ئەو زانایانەی بڕوای ڕەهایان بە تیۆریی گەشەسەندنە دەگرێتەوە. ئەوانەی لەم بنەمایەوە لە مرۆڤ دەڕوانن. هەروەها ئەم بابەتە پیشاندانی گرنگی ئەخلاقە بۆ مرۆڤ و پاراستنی بەها بەرزەکانی مرۆڤبوون لە جیهانی مۆدێرنی ئەمڕۆماندا. نەك تەنها ئەوەندەش، بەڵکو پیشاندانی گرنگی ئەخلاقە لە تەواوی تەمەنی مرۆڤایەتیدا کە لە بەشەکانی خوارەوە زیاتر باسی دەکەین.

## خاڵی یەکەم:

## "گرنگ و پێویست بوونی ئەخلاق بۆ مرۆڤ"

وەك گوتمان ئەم بابەتە لە لایەن فەیلەسوفەکان و زانایانەوە بە شێوەی جیا جیا باسی لێوە کراوە و لەسەری دوواون، لە ڕاستیشدا ئەوەندە بابەتێکی سادە نیە بتوانرێت لە چەند پەرەیەك باسی بکەین چونکە هەر بابەتێکی قوڵ پێویستە ڕەچاوی چەندین لایەنی بکرێت. ئێمە لێرەدا بە شێوەیەکی ڕوکەشی و جیاواز باسی لێوە دەکەین.

ئەخلاق چییە؟ هەر لەگەڵ وشەی ئەخلاقدا مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایەی ئێمە بیر لە جوانی هەڵسوکەوت و خۆشەویست بوون و کاری باشە دەکاتەوە، بە شێوەیەك خوێندنەوەی بۆ ئەم وشەیە لە چوارچێوەیەکی کردەیی دایە، بەو پێیەی ئەخلاق تەنها لە کردار و روکەش بوون کۆدەکاتەوە، بێ ئاگا لە ڕووە دەروونی و شاراوەکانی تر. بۆیە زۆر جار کەسانێکمان لێ دەردەچێت کە بە ڕووکەش ئەخلاقناس و لە ناخەوەش دوور لە ئەخلاقن، ئەخلاق چییە کەوایە؟ جۆرج واشنتۆن، یەکەم سەرۆکی و دۆزەرەوەی ئەمریکا، لە وتەیەکیدا دەڵێت: من لە ژیانمدا گشت سەرکەوتنەکانم لە لایەنی ئەخلاقی و رۆشنبیری و جەستەیی دەگەڕێنمەوە بۆ دایکم. لەم وتەیەی جۆرج بۆمان

دەردەکەوێت کە ئەخلاق بەشێکی لە پەروەردەوە دێت، پەروەردەش بەشێکە لەوەی کۆمەڵگا فێری مرۆڤەکانی دەکات، بەو پێیە بێت ئەخلاق بەشێکی بریتییە لەوەی کە مرۆڤەکان خۆیان دروستی دەکەن، بەوەش بێت ئەخلاق لە کۆمەڵگا جۆراو جۆرەکان جیاوازە و دەگۆرێت لای مرۆڤ. بۆ نموونە : ئەگەر لە کۆمەڵگای ئێمە ماچکردنی بوك لە لایەن زاواوە لە کاتی گواستنەوەی یاخود مارەبرینیدا کارێکی نا ئەخلاقی بێت، ئەوە لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان بگرە ئەرکێکە لەو کاتەدا و هیچ پەیوەندییەکی بە ئەخلاقەوە نیە، دەتوانین بلێین ئەو ئەخلاقەی کۆمەڵگا دروستی دەکات مەرج نیە بیکەین بە بنەمایەکی گشتی بۆ ئەخلاق. بۆیە ئەو پەروەردەیەی جۆرج لە ئەخلاقدا کە دایکی فێری کردووە و دەڵێت کە سەرکەوتووانەیە، دەکرێ لای ئێمە یان تاکی کۆمەڵگای تر بە جۆرێك نا ئەخلاقی بێت.

ئەی کەواتە ئەو ئەخلاقە چییە کە پێویستە ببێت بە بنەما بۆ مرۆڤەکان تا لە ڕێگایەوە هەڵبژێرن چ کارێك ئەخلاقییە و چ کارێك نا ئەخلاقی؟ لە ڕاستیدا ئەم پرسیارە وەڵامێکی ڕوونی نیە، چونکە هەم ئاکارەکان و کارەکانی مرۆڤ لە بارودۆخەکان دەگۆرێت تا دەستنیشانی ئەوە بکەین چ شتێك ئەخلاقییە و چ شتێك نا. زۆرێك دین دەکەن بە بنەمای دەستنیشانکردنی بنەماکانی ئەخلاق و لەو ڕێگایەوە بڕیار لەسەر

ئەخلاقیبوونی کارەکان دەدەن، بەڵام ئایا  هەر ئەوکاتیش بەدەست مرۆڤەکان نیە کە خوێندنەوە بۆ دەقە دینییەکان بکەن و خۆیان هەڵبژێرن کە چ شتێك ئەخلاقییە  و چ شتێکیش نا؟ لەم ماوەی پێشوو پیاوێکی دینیی ئیسلامی لە ئەمریکا هەڵسا بە مارەبرینی کچێك لە کچێکی تر لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە ئێمە دەزانین کە هاورەگەزبازی لە ئیسلامدا کارێکی نا ئەخلاقییە، بەڵکو زۆرێك دەڵێن کەوا سزاکەی کوشتنە، بەڵام ئایا  کە پیاوێکی دینی ڕێگا چارەیەکی شەرعی بۆ ئەم بابەتە دانا لە بنەمای چەند دەقێکی قورئانی و بڕیاریدا دوو کەسی هاورەگەزباز لە یەکتری مارە ببڕێت ئەوکات چی؟ زۆر جار کێشە لەم بابەتانەدا پەیدا دەبێت.[١-٤٤] (تەحسین حەمە غەریب) لە کتێبەکەیدا دەڵێت: (بەبۆچوونی من ئەخلاق لەو ڕووەوە فریای شەریعەتیش دەکەوێت، واتا ئەو شتەی کە سەلما ئەخلاقییە ئیدی ئەوە دینیشە(شەرعیشە)[٢-٤٤] یانی بە بڕوای ئەو ئەخلاق لە پێش دینەوە دێت یاخود گشت شتێکی ئەخلاقی لە دیندا جێگای دەبێتەوە، بەڵام چ شتێك ئەخلاقییە  و چ شتێکیش نا؟ لەو وڵاتانەی کە هاوسەرگیری هاورەگەزەکان یاساییە و ئاساییە، کارێکی ئەخلاقییە، بۆ نموونە لە وڵاتێکی وەك ئەمریکا. ئایا  دەکرێ بڵێین لەبەر ئەوەی کۆمەڵگا ئەو کارە بە ئەخلاقی دادەنێت ئەوە ئێمە دەکرێ لە دینیشدا ڕێگایەکی بۆ بکەینەوە؟

بەهەرحاڵ گەر لەم بابەتە ناکۆکانە دووربکەوینەوە و وای دابنێین کە ئەخلاق بریتییە لە پاراستنی مافەکانی مرۆڤ، ئەوە لە چەند لایەنێکەوە دەتوانین باس لە گرنگی ئەخلاق بکەین.

١- گرنگی ئەخلاق لە ژیانی مرۆڤدا: مرۆڤ ناتوانێت بە بێ ئەخلاق لە ژیاندا بەردەوام بێت، ئەگەرچی کۆمەڵگا دروستکەری ئەخلاق و بنەماکانیەتی، بەڵام مرۆڤ پێویستە بەو ڕێچکە ئەخلاقییەی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژی بەردەوامبێت، چونکە بە هەر شێوەیەك بێت ئەو بنەمایانەی کۆمەڵگا بۆ ئەخلاق دایدەنێت زۆرینەی ڕەچاوی مافەکانی مرۆڤ و ویستەکانی کراوە. بە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین کە ئەخلاق یاسا و شێوەژیانی کۆمەڵگا ڕێکدەخات، بە شێوەیەك دەستنیشانی ئەوە دەکات کە چ کارێك شیاوە و چ کارێکیش نا، بەڵکو بگرە هۆکاری مانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. مرۆڤ بەهۆی ئەخلاقەوە خێزانداری دەپارێزێت، بەهۆی ئەخلاقەوە ڕێزگرتن و ئاکارە بەرزەکانی مرۆڤ دەپارێزێت.

ئەخلاق لە ژیانی مرۆڤدا، دەیکات بە خاوەن ئامانج، دەیکات بە کەسێك چێژ لە جوانیەکانی ژیان ببینێت، ئەخلاق دروستکەری هەستە جوانەکانی وەك خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی و لێبوردەیی و دڵسۆزی و خۆشی مرۆڤە، واتە مرۆڤ بەبێ بوونی ئەخلاق خاڵی دەبێتەوە لە گشت ئەو هەستانە، لە ئەگەری نەمانی ئەو هەستانەی مرۆڤیش شتێك نامێنێت بە ناوی ژیان.

٢-گرنگی ئەخلاق لە بەردەوامبوونی ژیان: ئەخلاق مرۆڤ دەپارێزێت لە زاڵبوونی دەسەڵاتی عەقڵ بەسەر دڵدا ئەگەر بێتوو گشت هەست و عاتیفەیەك بە دڵ ببەستینەوە، چونکە زۆرینەی ئەو تاوان و جەنگانەی مرۆڤ بە درێژایی مێژوویدا بەسەریدا هاتووە بەهۆی دەسەڵاتی عەقڵی بووە و لە ئەگەری نەمانی ئەخلاق بووە (لێرەوەیە کە ڕەخنە لە "عەقڵ" دەگیرێت).[٤٥] ئەگەر بێتوو زیاتریش وردبینەوەی لێی دەتوانین بڵێین کە مرۆڤ ئەخلاقی نەك تەنها بۆ خۆیەتی، بەڵکو بۆ ئەو بونەوەرانەی تریشە کە هاوشان لەگەڵ مرۆڤ لە سەر زەویدا دەژین. ڕاستە مرۆڤ ئاژەڵەکان ڕاودەکات و دەیانخوات، بەڵام ئەخلاق ئەوەشی دەستنیشان کردووە کە چ جۆرە گیانلەبەرێك بۆ خواردن شیاوە و بە چ شێوەیەکیش ڕاوبکرێن، لە هەمان کاتدا ئەخلاق وا لە مرۆڤ دەکات بە بەزەیی بێت بەرامبەر ئاژەڵەکان و مرۆڤ ناچار دەکات بە جوان مامەڵەکردن لەگەڵیان. ئەم خاڵانە گشتی بەهۆی ئەخلاقەوەیە، کاتێك ئەخلاق نەما، ژیانیش بەردەوامی نامێنێت.

خاڵی دووەم :

## "لە ئەگەری نەمانی ئەخلاقدا"

بەپێی ئەو خاڵە گرنگانەی پێشوتر باسمانکرد دەربارەی گرنگی هەبوونی ئەخلاق و پەیوەندی ئەخلاق بە سروشتی مرۆڤەوە و چەند باسێکی تر، دەبێ بڵێین کە لە ئەگەری نەمانی ئەخلاقیشدا گشت ئەو خاڵە جوانانە دەبنە قوربانی و بونیان نامێنێت.

زۆرێك لە مرۆڤەکان ئەخلاق لە دەستدەدەن لە پێناو حەز و ئارەزویان، بۆیە ناتوانین بڵێین گشت حەزو ئارەزوویەکی مرۆڤ ئەخلاقییە. لەدەستدانی ئەخلاق لە کۆمەڵگای مۆدێرن و سەردەمی نوێدا بوونی نییە، واتە کۆمەڵگایەك ناتوانرێ بە شێوەیەکی گشتی نا ئەخلاقی بێت، بۆیەش نا ئەخلاقی مرۆڤ لە کرداردا زۆربەی کات لەو شوێنانەیە کە مرۆڤ کەمینەیە یاخود ئەو شوێنانەی کە پەیوەندیان پچڕاوە لەگەڵ کۆمەڵگای دەرەکی. بۆ نموونە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا هەمیشە پێغەمبەرانی خۆی بە نموونەی ئەخلاق بەرزی و رەوشت جوانی هێناوەتەوە، لە چەند سورەتێکدا باس لە قەومی پێغەمبەر (لوگ) دەکات سەلامی خوای لێبێت، تێیدا هاتووە کە خەڵکەکە کەسانێك بوون لە سروشتی مرۆڤ لایاندابوو، جگە لەوەی

هاورەگەزباز بوون، ڕێگر بوون و پەلاماری هەر کەسێکیان دەدا کە بهاتایە شوێنەکەیان. لێرەدا هاورەگبەزبازی لە ئەنجامی نەمانی ئەخلاقە لە کۆمەڵگادا، بەڵام ئەو کۆمەڵگایەی قورئانی پیرۆز باسی دەکات زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو کۆمەڵگا مۆدێرنانەی ئێستا، بۆ نموونە لە ئێستادا جیهانگیریی هەیە کە کۆمەڵگاکان بەیەك دەبەستێتەوە، ئەوکات نەبوو و ئەوەش وادەکات بڵێین کە ئەو کۆمەڵگایەی قەومی لوت تێیدا ژیاون کۆمەڵگایەکی داخراو بووە، بەڵام ئەی چۆن لە وڵاتێکی وەك ئەمریکا بە یاسا دەکرێت و کارێکی ئەخلاقییە،[٤٦] هەر ئەوەندەش نا بەڵکو هەولێکی زۆر هەیە لە زۆربەی وڵاتان تا هاوسەرگیریی هاوڕەگەزبازی بە یاسا بکرێ، ئەوکات چی؟ لەم سەردەمەدا زۆرێك لەگەڵ ئەوەن کە هاورەگەزبازی سروشتێکی مرۆڤە کە لەگەڵی لە دایك دەبێت، بۆیەش ئەخلاقییە، یاخود دەڵێن کەوا ئەخلاقییە چونکە زیانی بۆ مرۆڤ نیە، هەرچۆنێك بێت، قەومی لوت خراپی و پیسی کارەکەی خۆیان دەزانی، لە قورئانی پیرۆزدا، لە سورەتی (الأعراف)دا ئەوە دەسەلمێنێت کاتێك پێغەمبەر لوگ داوای وازهێنان لە خراپەکاریان لێ دەکات.( وما کان جواب قومة إلا أن قالوا أخرجوهم من قریتکم إنهم أناس یتطهرون) (الأعراف٨٢).[٤٧] واتە: وەڵامی قەومەکەی تەنها ئەوەبوو کە گوتیان ئەوانە دەربکەن لە شارەکەتان چونکە ئەوانە کەسانێکن

پاکی و جوانی بڵاودەکەنەوە. لێرە بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازی ئەو کۆمەڵگایە لەگەڵ کۆمەڵگایەك لە ئێستادا زۆرە. بەڵام ئایا دەکرێ بڵێین لە ئێستادا ئەخلاقییە و لەو کاتەدا نا ئەخلاقی بووە چونکە ئەوان هەم زیانیان بۆ خەڵکی تر هەبووە و هەم دەشیانزانی کە خراپەکارن؟

لە دەستدانی ئەخلاقی مرۆڤ دەبێت ئەنجامی لێبکەوێتەوە، بۆ نموونە مرۆڤ لە ئەنجامی لە دەستدانی ئەخلاقیدا لە مرۆڤبوون دەردەچێت، یاخود باشتر بڵێین سروشتی مرۆڤی تێدا بەدی ناکرێت، بە پێی ئەم هاوکێشەیەش بێت دەتوانین بڵێین کەوا: هاورەگەزبازی دەرچوونە لە سروشتی مرۆڤ، دەرچوون لە سروشتی مرۆڤیش نا ئەخلاقییە، بۆیە هاورەگەزبازی کارێکی نا ئەخلاقییە. لە بەرامبەردا ئەگەر بەو گریمانەیە بدوێین کە هاورەگەزبازی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ سروشتی جەستەیی و پێکهاتەیی مرۆڤەوە هەیە و لەگەڵ لە دایکبوونیدا بەدیدێت، ئەوکات دەبێ بڵێین چۆن دەکرێ خودا ڕقی لە کەسانێك بێت کە خۆی بەو سروشتە بەدیهێناون چونکە ئەو ڕێژەیە ڕۆژ دوای ڕۆژ لە زیادبوونە، چارەسەرێکیش نییە ئەوان لەو لادانە ڕزگار بکات، بەڵکو بگرە ئەوکات بە کەم سەیرکردنی ئەم مرۆڤانە کارێکی نا ئەخلاقی دەبێت (کە لە ئێستادا لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان بەم شێوەیە).

لە لایەکی ترەوە، ئەگەر تاکە بنەمای ئەخلاق و ئەخلاقیبوون بگەڕێنینەوە بۆ مرۆڤ و سروشتەکەی، لە ئەگەری لادان لێی مرۆڤ نا ئەخلاق دەبێت، ئەوا دەبێ بڵێین هاوڕەگەزبازیش نا-ئەخلاقی بوونە. هەرچۆنێك بێت ئەم بابەتە پێویستە زیاتر شارەزایان قسەی لێوە بکەن.

## "لە دەستدانی ئەخلاق، دەرچونە لە مرۆڤبوون"

ئەگەر لە فیلمەکانەوە سەیر بکەین، زۆربەی حاڵەتەکانی دەرچونی مرۆڤ لە سروشتی خۆی و نەمانی ئەخلاقی، لە کاتی وێرانبوونی جیهانە(Apocalypse)، مرۆڤ کاتێك هەست دەکات کە ئەو ژیانەی کۆتایی دێت، پەنا بۆ هەمووشتێك دەبات، ئەخلاقی لە دەستدەدات، چونکە ئیتر وا هەست دەکات پێویستی پێی نابێت. لە فیلمی (The Divide) دا کە باس لە وێرانبوونی جیهان دەکات بەهۆی جەنگەوە (وەك لە بەشی دووەمی ئەم کتێبە باسمان کرد)، لەم نێوەندەدا کۆمەڵێك رزگاریان دەبێت و لە ژێرەزەمینێکدا دەمێننەوە کە دواتر هیچ رێگایەکیان نامێنێتەوە بۆ چونە دەرەوە، لەم نێوەندەدا بۆیان دەردەکەوێت کە رزگاریان نابێت و ژیانیشیان بەشی چەند رۆژێك ناکات، لەوێدا کۆمەڵێك هەڵدەستن بە کاری خراپە، بە شێوەیەك کە هیچ شتێك نامێنێتەوە بیکەن، نە هەوڵ بۆ رزگاربوون دەدەن نە بیردەکەنەوە، نە هیچ شتێك، تەنها چەند کارێکی نارەوا. لێرەدا گرنگی ئەخلاقمان بۆ دەردەکەوێت لە رێکسختنی کارەکانی مرۆڤ، کاتێك ئەخلاق نەما، هیچ شتێك نامێنێتەوە بۆی بژین تەنها کاری خراپە نەبێت.

لەم نێوەندەدا، دەتوانین بڵێین مرۆڤ کاتێك ئەخلاقی نامێنێت کە هۆکارێکی گەورە هەیە وەك ئەوەی کە دەزانن دەمرن. زۆرێك لەوانەی کە توشی نەخۆشی شێرپەنجە دەبن، ئەگەر لە خێزانێکدا بن، داوای شتانێك دەکەن کە پێشتر نەیاندەتوانی بیکەن، بۆ نموونە بەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر، یاخود سێکسکردن و چەند کارێکی تر. بۆیە بێ ئومێدبوون لە ژیاندا یاخود دڵنیابوون لە مردن وا لە مرۆڤ دەکات بەد ئەخلاق بێت زۆرجار، یاخود تەنانەت دەربچێت لە مرۆڤبوون.

لە فیلمی (The Colony) وەك لە بابەتی جیهان لە وێرانبوون و دوای وێرانبوونی باسمان لێوەکرد، مرۆڤانێك پەیا دەبن کە گۆشتی مرۆڤ دەخۆن و هیچ شتێکیتر ناکەن، وەك ئەوەی ئاژەڵێك بن، خاڵیبونەتەوە لە مرۆڤ بوون. زۆرێك رەخنە لە ئایا تێکی قورئانی پیرۆز دەگرن بەوەی کە خودای گەورە وشەیەکی خراپی بەکارهێناوە بۆ وەسفی مرۆڤ کاتێك بە ئاژەڵی دەشوبهێنێت بەوەی کە گوێیان هەیە و گوێ ناگرن و دڵیان هەیە و تێناگەن، وەك لە سورەتی (الأعراف)دا هاتووە : (**أولئك كالأنعام بل هم أضل** ) (١٧٩).[٤٨] واتە : ئەوانە وەك ئاژەڵن بەڵکو گومراتر. ئایا مرۆڤ ناگات بە حاڵەتێك کە خراپتر بێت لە ئاژەڵ؟. بەڵێ، ئەوکاتەی لە ئەخلاق خاڵی دەبێتەوە و پەنا بۆ شتانێك دەبات کە تەنانەت ئاژەڵیش ئەو کارانە ناکات.

بۆیە مرۆڤ کاتێك ئەخلاقی نابێت، سیستمی ژیانیشی تێکدەچێت، بەڵکو ئیتر بۆی گرنگ نابێت، لە فیلمی ( Seeking a Friend for The End of The world)، کە فیلمێکی سینەمایی کۆمیدیە، باسی ئەو کاتە دەکات کە کاتێك مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت دەمرێت پەنا بۆ چی دەبات و چی دەکات، وەك لە بابەتەکانی پێشوتر باسمان کرد. لە دیمەنێکدا دەبینین کاراکتەری سەرەکی فیلمەکە دەچێت بۆ ماڵی خوشکەکەی بۆ ئەوەی بە بۆنەی کۆتایی هاتنی جیهان خواحافیزی لێبکات، دەبینێت ئاهەنگێکی گەورە لە ماڵیان سازکراوە و تێیدا کاری ناشیاو دەکرێ، لە ناکاو خوشکەکەی ماچی دەکات، ئەو پێی دەڵێت چۆن شتێکی وا دەکەی کە من برای تۆم؟. ئەویش دەڵێت کێ ئیتر بۆی گرنگە، تازە جیهان بەرەو کۆتایی دەڕوات. وەك نموونەی هەمان فیلمەکەی پێشوتر، نەمانی ئەخلاق لێرەدا هۆکارە بۆ تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەلآیەتییەکانیش، بەڵکو بگرە ئەخلاق تاکە هۆکارە کە مرۆڤی وەستاندووە لەوەی هەموو کارێك نەکات، بەڵکو رێکی خستووە کە مرۆڤ پێویستە چۆن بێت و پەیوەندییەکانی دەبێ چۆن بن، نەمانی ئەخلاق دەرچوونی مرۆڤە لە بازنەی مرۆڤبوون.

## خاڵی سێیەم:

## "ئەخلاق، جێگرەوەی ئەقڵ لە پاراستنی مرۆڤ و مرۆڤبوون"

وەك لە یۆنانی کۆندا هاتووە و زۆرجار دەوترێتەوە (الانسان حیوان ناگق) واتە (مرۆڤ گیانلەبەرێکی قسەکەرە) یاخود دەگوترێ (مرۆڤ گیانلەبەرێکی ئاقڵە) یاخود هەر جۆرە وتەیەك کە ئاماژە بێت بە جیاکردنەوەی مرۆڤ لە گیانەوەر بەهۆی ئەقڵەوە، لە ڕاستیدا هەر ئەو جۆرە وتانە بووە هۆی نووسینی ئەو بابەتە، چونکە بەداخەوە زۆرێکیش لە ئێستادا بڕوایان وایە کە ئەقڵ مرۆڤ لە گیانەوەر جیا دەکاتەوە، مرۆڤ دەتوانێت بیربکاتەوە و ئاژەڵ ئەو توانایەی نیە بۆیەش ئەوە تەنها لە ڕوی فیکر و کەلتوریەوە ڕاستە کە مرۆڤ جیادەکرێتەوە لە ئاژەڵ چونکە توانای پێشکەوتن و گۆڕانی هەیە بەلاّم ئاژەڵ نیەتی. دەمەوێ لێرە بڵێم کەوا ئەقڵ هۆکاری پێشکەوتن و شارستانی بوونی مرۆڤە بەلاّم ئەخلاق ئەو ڕۆڵە نابینێت، ئەخلاق سیستم دروست دەکات، کە بەهۆیەوە شێوەژیان ڕێکدەخات. گەر لێرە نموونەیەك بهێنمەوە باسەکە ڕونتر دەبێت.

لە فیلمە نوێکەی سوپەرمان، بە ناوی (Man Of Steel) کە بەڕاستی کاردانەوەیەکی زۆر باشی هەبوو، بە جۆرێك خەڵکێکی زۆر ڕۆشتن

بۆ سینەماکان بۆ سەیرکردنی، لەم فیلمەدا دیمەنێکی تێدابوو زۆر سەرنجی ڕاکێشام، بە شێوەیەك منی هێنا بۆ ئێرە و نووسین لەسەری، دیمەنێك کە تا تەواوبوونی فیلمەکە بیرم لای بوو. بەڵام پێش ئەوە با کەمێك لە چیرۆکی فیلمەکە باس بکەین، تا دەگەین بە دیمەنەکە.

زۆرێکمان چیرۆکی چۆنیەتی پەیابوونی سوپەرمان دەزانین، بۆ ئەوانەیش نازانن. سوپەرمان لە ئەسڵدا بونەوەرێکی هەسارەیەکی ترە بە ناوی (کریپتۆن)، خەڵکی ئەم هەسارەیە زۆر لە مرۆڤەوە نزیکن لە ڕووی پێکهاتەی جەستەوە، لە مرۆڤیش پێشکەوتوترن لە ڕووی ئەقڵەوە بە شێوەیەك هەسارەیەکیان پێکهێناوە لە شارستانیەت. ئەوەی جیاوازە لەم هەسارەیەدا و لەگەڵ زەوی، بریتییە لەوەی کە لەوێدا منداڵ بە ڕێگای سروشتی لە دایك نابێت، بەڵکو شوێنێکی تایبەت هەیە بۆ منداڵ هەڵگرتن کە وەك سکی دایك وایە، ئەو منداڵانەی لەوێ پێدەگەن و گەشە دەکەن، بەهۆی پێشکەوتنەوە، خەڵکانی ئەم هەسارەیە وایانکردووە بتوانن لە بچوکیەوە داهاتووی منداڵەکان دەستنیشان بکەن، واتە بۆ نموونە چەند منداڵێك دابین دەکەن کە لە دایك بوون ببن بە کرێکار، لە هەمان کاتدا هەندێکیتر ئامادە دەکەن کە ببن بە سەرکردە. لەم نێوەندەدا، کودەتایەکی سەربازی لەسەر ئەم هەسارەیە دەکرێت، بە شێوەیەك لایەنی سەرۆکی

سەربازی ئەم هەسارەیە دەست بەسەر دەسەڵاتی ئەم هەسارەیە دادەگرێت، یەکێك لە سەرکردەکانی سەر ئەم هەسارەیە، کە باوکی سوپەرمانە لەگەڵ هاوسەرەکەی کاتێکی زۆرە پلانێکیان داناوە کە منداڵێکی سروشتی پێك بهێنن و بیبەنە دەرەوەی ئەم هەسارەیە، بۆ ئەوەی وەك باوکی دەڵێت: داهاتوویەکی هەبێت جیاوازتر و گەورەتر لە گشت ئەو داهاتووانەی لەم هەسارەیە بۆ منداڵەکان دانراوە. هەرچەندە سەرۆکی سوپاکە رێگری لێدەکات بەڵام باوکی سوپەرمان، منداڵەکەی رەوانەی زەوی دەکات. سوپەرمان کە ناوی (کای)ە و لە زەوی ناوی (کلارك)ی لێدەنرێت، بەهۆی ئەوەی کە هەسارەی زەوی هێزی کێشکردنی زۆر لاوازترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو هەسارەی سوپەرمان لێوەی هاتووە (کریپتۆن)، لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کە زۆر لاوازترە لە چاو ئەو ژینگەیەی هەسارەی (کریپتۆن) هەیبووە، وا لە سوپەرمان دەکەن کە ببێتە خاوەنی توانایەکی لە ڕادەبەدەر، هەرچۆنێك بێت، دوای لەناوچوونی هەسارەی (کریپتۆن)، سەرۆك سوپاکە لەگەڵ چەند کەسێکیتر شوێنەکەی منداڵەکە(سوپەرمان) دەدۆزنەوە و بەدوایدا دێن بۆ سەر زەوی و لە دوایدا بڕیاری لە ناوبردنی دەدەن.

دوای ئەوەی یەکێك لەوانەی لەگەڵ سەرۆك سوپاکەی هەسارەی (کریپتۆن) بە ناوی (فائۆرا) لەگەڵ سوپەرمان دەجەنگێت و وا دەردەکەوێت لە سوپەرمان بەهێزترە لەگەڵ ئەوەی هەمان هێزیان دەبێ هەبێت، لە دیمەنێکدا بە سوپەرمان دەڵێت: جیاوازی من و تۆ ئەوەیە کە تۆ لە هەسارەیەك گەورەبووی فێری مۆراڵ (ئەخلاق) کراوی، بەڵام ئێمە هیچ شتێکمان نیە بە ناوی (ئەخلاق). لێرەوە ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە مرۆڤەکان هەستە جوانەکان و ئەخلاق بەهۆی پەروەردەوە فێردەبن، هەر ئەو ئەخلاقەشە وای لە سوپەرمان کردووە کە نەتوانێت بە باشی بجەنگێت، چونکە مرۆڤی بە ئەخلاق کەمترین هەستە نێگەتیڤەکانی لا جێدەبێتەوە، هیچ کات مەبەستی کوشتن و لەناوبردنی بونەوەرەکانی تری نیە. بۆیەش لە هەموو هەڵسوکەوتێکی لەم جۆرە دوورە.

ئەوەی لەم دیمەنەی سەرەوە دەبینین، بریتییە لە پیشاندانی دوو جۆرە مرۆڤ، مرۆڤێك خاڵی لە ئەخلاق بەڵام پێشکەوتوو لە ئەقڵ، مرۆڤێکیش بە ئەخلاق و خاوەن ئەقڵ، ئەو مرۆڤەی هیچ شتێك نازانێت دەربارەی ئەخلاق هیچ کات ویستی ژیانێکی ڕێکخراو و ئاسایی نیە، پەنا بۆ هەر شتێك دەبات کە بەهۆی بیرکردنەوەی پێی دەگات، ئەوەی بۆی گرنگە دەستەبەرکردنی شتەکان و بەدەستهێنانیەتی، جا ئایا ئەو شتانەی کە

دەیەوێت لە ڕێگاکەی بۆ بەدیهێنانی چ زیانێك بە مرۆڤەکانی تر بدات یاخود چ کاولکاریەك بکات لە پێناوی بۆی گرنگ نیە، سەیری دەسەلآتە فاشیستەکان بکەن، بۆ کپکردنی نارەزاییەکان دژی دەسەلآتەکەیان، پەنا بۆ هەر شتێك دەبەن کە نا ئەخلاقییە، لە بەکارهێنانی هێزەوە بگرە تا کوشتنی مرۆڤەکان. بەهاری عەرەبی وانەیەکی زۆر جوانی پێداین دەربارەی ئەم بابەتە، زۆرێك لە سەرکردە بەد ئەخلاقەکانی بۆ دەرخستین کە لە پێناو مانەوەی خۆیاندا هەر کارێکی نا ئەخلاقییە کردیان، زۆرێکیش لە سیاسەتە نا ئەخلاقییەکانی ولآتانی بۆ دەرخستین. لە بەرامبەر ئەوانەدا مرۆڤە بە ئەخلاقەکان هەمیشە هەوڵی دروستکردنی ژیانێکی ڕێکخراو و جوان دەدەن، هەر شتێك دەکەن تا ولآت تەندرووست بێت و هەرگیز نەکەوێتە حاڵەتێك کە پەنا بۆ کاری نا ئەخلاقی ببرێت. بیرمە دوو ساڵ بەر لە ئێستا، مامۆستای بیرکاریمان لە قوتابخانە، قسەیەکی زۆر جوانی کرد دەربارەی سیاسەتی ئەم ولآتەی خۆمان، گوتی: کوڕەکان، ئەم ولآتەی ئێمە پێویستی بە سەرکردەی زیرەك نیە، بەڵکو بگرە دونیایەك لە سەرکردەی زیرەك و ئاقڵمان هەیە، بەلآم پێویستی بە سەرکردەی دڵسۆزە. بەو واتایەی کە دڵسۆزی بەشێکی گرنگی ئەخلاقە، مرۆڤ کە دڵسۆز نەبوو بۆ ولآت بێگومان لە بەشێکی ئەخلاقیدا شەلە، ئێمە با خاوەنی کەسانێکی ئاقڵ بین، بەلآم کە

ئەخلاقییان نەبوو، سەرئەنجام وەك ئەو كەسەی لێدێت كە ئامادەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجە ئەقڵییەكانی، گشت ئەخلاقە جوانەكان بشكێنێت، وەك ئەو كەسەی لەگەڵ سوپەرمان دەجەنگا و هەرەشەی وێرانكردنی زەوی دەكرد تەنها بۆ ئەوەی ببێت بە خاوەن هێزێكی نەبەزیو، لە كاتێكدا دەیتوانی بە ئاشتی لەگەڵ مرۆڤەكان بژی. بەڵام سوپەرمان لەگەڵ ئەوەی ئەو كەسانەی لەگەڵی دەجەنگا كەسانێك بوون لە جۆری خۆی (دواین كەسانێك بوون كە رزگاریان بوبو لە هەسارەی كریپتۆن) بەڵام هەر بۆ مرۆڤایەتی دەجەنگا، چونكە لە مرۆڤایەتی فێری ئەخلاق بوبو. ئەوەیە جیاوازی مرۆڤی بە ئەخلاق و مرۆڤی بەد ئەخلاق. یەكێكیان بۆ بەرژەوەندیە تایبەتیەكانی خۆی هەوڵ دەدات و یەكێكیش بۆ بەرژەوەندییە گشتیەكان.

مرۆڤە بەد ئەخلاقەكان ژیانێكیان ناوێ بۆ مرۆڤایەتی تەنها ناچارن وەك خەڵكی تر بژین، بۆیەش هەرچەندە خاوەن ئەقڵ بن هێشتا هەر ئاژەڵن.

# "لێکۆڵینەوەیەکی نوێ لەسەر ئەخلاق"

لەبەر گرنگی چەمکی ئەخلاق و پێویستی لە نێوان مرۆڤەکان، زۆرێك لە زانایان هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی بزانن کە ئایا ئەخلاق تەنها لای مرۆڤ بوونی هەیە یاخود ئاژەڵیش خاوەن ئەخلاقن. (فرانس دێ وال) خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا لە کۆمەڵناسی و سروشتی مرۆڤ و هەڵسوکەوت، کە زانایەکی هۆلەندیە، لە چەند تاقیکردنەوەیەکیدا بۆی دەرکەوتووە کە جگە لە مرۆڤ ئاژەڵەکانیش خاوەن چەند هەستێکی جۆراو جۆرن کە ئەوەش وایان لێدەکات بونەوەرێکی ئەخلاقی بن.[٤٩] ئەو نموونە بە مەیمونی چیمپانزی دەهێنێتەوە، لە تاقیکردنەوەکەیدا (فرانس) بۆ ئەوەی بزانێت کە ئایا هەستکردن بە یەکسانی لە نێوان ئاژەلأن هەیە کە بەشێکە لە ئەخلاق. هەڵدەستێت بە دانانی دوو قەفەسی(بۆکس) بچوك لە تەنیشت یەکەوە، هەر قەفەسێك مەیمونێکی شەمپانزی تێدایە، کاتێك ئەو کەسەی تاقیکردنەوەکە دەکات کە دکتۆرێکە، بەردێك بە مەیمونێکی قەفەسی یەکەم دەدات، مەیمونەکە بەردەکەی پێدەداتەوە، ئەویش لە بەرامبەر ئەو کارەیدا، پارچەیەك خەیار دەدات بە مەیمونەکە، دواتر بەردەکە بە مەیمونی قەفەسی دووەم دەدات، ئەویش کە پێی دەداتەوە، ئەمجارە لە جیاتی خەیار، دنكێك

ترێی پێدەدات، پاشان دووبارە بەردەکە دەداتەوە بە مەیمونی یەکەم، بەڵام کاتێك بەردەکەی دەداتەوە، لە جیاتی دنکە ترێ، دووبارە خەیاری پێدەدات، ئەوەش مەیمونەکە توڕە دەکات و وای لێدەکات خەیارەکە بۆ دکتۆرەکە بهاوێت و هەست بەوە دەکات کە ئەوە یەکسانی نیە وەك ئەوەی بڵێت بۆچی مەیمونەکەی تەنیشتم ترێ دەخوات و من خەیار بخۆم.

ئەو تاقیکردنەوەیە هەنگاوێکی زۆر گەورەبوو بۆ دۆزینەوەی ئەخلاق لە نێوان گیانەوەراندا. هەرچەندە (فرانس) یەکێکە لەوانەی بڕوای بە تیۆری گەشەسەندنە، بەڵام ئەو تاقیکردنەوەی بۆ ئێمەش سودێکی زۆری هەبوو.

چی فێربووین لێوەی؟

مرۆڤ خاوەن ئەخلاقە، هەروەها ئاژەڵیش، بەڵام ئەخلاقی مرۆڤ زۆر بەرزترە لەوەی کە ئاژەڵ هەیەتی، چونکە مرۆڤ هەم دەوڵەمەندە لە هەست، هەم بیرکردنەوەش، بەڵام ئاژەڵ ئەو ئەخلاقەی هەیەتی تەنها بۆ ڕێکخستنی شێوە ژیانیەتی، واتە وەك پێشتر باسمان کردووە لە بەشەکانی تر، ئەخلاق هۆکارێکی گرنگە بۆ ڕێکخستنی ژیان، ئاواش گرنگە بۆ ڕێکسختنی ژیانی ئاژەڵ . هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە بۆچی ڕۆژێك لە ڕۆژان مەیمونێك بڕیار نادات وەك ئاژەڵێکی تر بژی یاخود وەك مرۆڤ بژی؟ چونکە سروشتی ئەو و ئەخلاقی ئەو بریتییە لەوەی کە ئاژەڵێك بێت، ئینجا تەنانەت لە نێوان

ئاژەڵەکاندا، مەیمونێك بێت، تەنانەت لە نێوان جۆری مەیمونەکانیش، مەیمونێکی دیاریکراو بێت.

لە کۆتاییدا، ئەوەی وا لە مرۆڤ دەکات لە ئاژەڵ نەچێت، ئەخلاقییەتی، نەوەك ئەقڵی، مرۆڤە نا ئەخلاقییەکان واهەست دەکەن بەهۆی ئەقڵەوە دەگەن بە هەمووشتێك، بەڵام تەنانەت ناگەن بە ژیانیش، ژیان دەربارەی ئامانجەکانی ئەقڵ نیە، ژیان دەربارەی جوانی هەڵسوکەوت و هەست و رۆیشتنە بە پێی ئەو سروشتەی مرۆڤ لەسەری درووستکراوە.

# سەرچاوەکان:

## پێشەکی

[١] The FP Top ١٠٠ Global Thinkers, (٢٠١٠), Tariq Ramadan No. ٦٢
Source: http://foreignpolicy.com/٢٠١٠/١١/٢٢/the-fp-top ١٠٠-global-thinkers ٥

[٢] When does the month of Ramadan begin? Science and Wisdom, Tariq Ramadan (٢٠١٤)
Source: http://tariqramadan.com/english/٢٠١٤/٠٦/٢٤/when-does-the-month-of-ramadan-begin-science-and-wisdom/

[٣] ‘Collapse of Civilization’: Theoretical explanations, Ausama Anwar (٢٠١٤)
Source: http://kurdistantribune.com/٢٠١٤/collapse-of-civilization-theoretical-explanations

[٤] Nasa-funded study warns of ‘collapse of civilisation’ in coming decades (٢٠١٤)
Source:http://www.independent.co.uk/news/science/nasafunded-study-warns-of-collapse-of-civilisation-in-coming-decades ٩١٩٥٦٦٨.html

[٥] Nasa-funded study: industrial civilisation headed for 'irreversible collapse'? (٢٠١٤)

Source: http://www.theguardian.com/environment/earth-insight/٢٠١٤/mar/١٤/nasa-civilisation-irreversible-collapse-study-scientist

## بەشی یەکەم

[٦] Daisaku Ikeda, Toward ٢٠١٥ — calling for a Nuclear Weapons Convention, April ٢٠١٢ – The Japan Times

[٧] Albert Einstein in an interview with Alfred Werner, Liberal Judaism ١٦ (April-May ١٩٤٩), ١٢. Einstein Archive ٣٠ ١١٠٤, as sourced in The New Quotable Einstein by Alice Calaprice (٢٠٠٥), p. ١٧٢.

[٨] Dramatic Growth of American Buddhism: An Overview, by Kenneth K. Tanaka
Source:http://www.rk-world.org/dharmaworld/dw_٢٠١١julyseptdramaticgrowth.aspx

[٩] A Textbook of Psychology, Edward B. Titchener. (Published ١٩٠٩)

[١٠] Psychopathia Sexualis, Richard V. krafft-ebing (١٨٨٦)

[١١] Biological Exuberance: Animal Homosexuality and Natural Diversity, Bruce Bagemihl (١٩٩٩)

[١٢] Researcher Simon LeVay Talks About the Science of Sexuality.
Source:http://public.elmhurst.edu/news/archive/١٧٤٥٨٢٢٥١.htm

[١٣] سێکسی سروشتی، مەحمود شێرزاد – ماڵپەری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ
Source:http://www.knwe.org/Direje.aspx?Jimare=١٨١٢٠&Cor=٢&Besh=Witar

[14] گاڵتەجاڕی عەقڵی مرۆڤ، عەلی وەردی، لا ١٠-١٢

[15] Slavery

Source: http://en.wikipedia.org/wiki/Slavery

[16] Simon Linguet on describtion of Wage Slavery. (١٧٦٣)

Source: http://www.worldsocialism.org/spgb/forum/general-discussion/wage-slavery

[17] How the U.S. Lost Out on iPhone Work, New York Times (٢٠١٢)Source:

http://www.nytimes.com/٢٠١٢/٠١/٢٢/business/apple-america-and-a-squeezed-middle-class.html?pagewanted=all

[18] Soccer-Mad Church Worships Diego Maradona as a God, By Yolanda Yebra (٢٠١١)

Source:http://latino.foxnews.com/latino/sports/٢٠١١/٠٦/٢٢/soccer-mad-church-worhips-diego-maradona-as-god/

[19] Samuel Johnson on Language (١٧٥٥)

Source: http://www.samueljohnson.com/language.html

### بەشی دووەم

[20] Big-bang model.

Source:http://www.britannica.com/EBchecked/topic/٦٤٨٩٣/big-bang-model

[21] ١٨٧٨-Denison, Texas, UFO.

Source:http://ufos.about.com/od/ufohistory/p/denisontexas.htm

[٢٢] Brief history of cannibal controversies. (٢٠٠١).
Source:http://exploration.vanderbilt.edu/news/news_cannibalism_pt٢.htm

## بەشی سێیەم

[٢٣] Oneirology: Understanding the How, the Why and the What.
Source: http://dreamdoze.com/oneirology-understanding-the-how-the-why-and-the-what/

[٢٤] خەونەکان لە نێوان زانست و بیرو باوەڕدا، عەلی وەردی

[٢٥] Hypnagogia: The Unique State of Consciousness Between Wakefulness and Sleep, Andreas Mavromatis (١٩٨٧)

[٢٦] Paprika Movie Quotes (٢٠٠٦)
Source: http://www.imdb.com/title/tt٠٨٥١٥٧٨/quotes

[٢٧] سرووشتی مرۆڤ و چیرۆکەکەی دۆنکیشۆت (٢٠١٢)، ئوسامە ئەنوەر
Source: http://www.rojana.net/old/index.php/penusi-azad/٢٢٣٦ ٢٠١٤ ٠٢ ١٧ ٢١ ١٨ ٤٥

[٢٨] خەونەکان لە نێوان زانست و بیرو باوەڕدا، عەلی وەردی

[٢٩] القرآن الكريم، سورة يوسف (٤٢–٥٠)

## بەشی چوارەم

[٣٠] 'Purge' director straddles two worlds (٢٠١٣)

Source: http://entertainment.inquirer.net/١٠٤٥٠٢/purge-director-straddles-two-worlds

[٢١] Japanese proverbs

Source: http://en.wikipedia.org/wiki/Japanese_proverbs

[٢٢] On the Origin of Species

Source: http://darwin-online.org.uk/EditorialIntroductions/Freeman_OntheOriginofSpecies.html

[٢٣] SURVIVAL OF THE FITTEST? By Alan Keyes (٢٠٠١)

Source: http://www.wnd.com/٢٠٠١/٠٧/٩٩٢٧/

[٢٤] The Real William Graham Sumner (٢٠١١)

Source: https://mises.org/library/real-william-graham-sumner

[٢٥] Full Definition of WALL STREET

Source: http://www.merriam-webster.com/dictionary/wall%٢٠street

[٢٦] What America Can Learn From The Purge, By Robert Hoggard

Source: http://www.huffingtonpost.com/robert-hoggard/what-america-can-learn-fr_١_b_٣٥٦٤٢٧٣.html

[٢٧] Quotes by Edgar Alan Poe

Source: http://www.goodreads.com/quotes/٢٠٣٦٢-i-have-no-faith-in-human-perfectibility-i-think-that

[٢٨] Invisible Monsters, Chuck Palahniuk (١٩٩٩)

[٢٩] Luddite wiki

Source: http://en.wikipedia.org/wiki/Luddite

[٤٠] Robots become reality, The Guardian (٢٠٠٩)

Source:http://www.theguardian.com/technology/gallery/٢٠٠٩/dec/٠٢/robots-japan

[٤١] From Dutch Wives to Love Dolls, Takatsuki Yasushi (٢٠٠٨)
[٤٢] I, Robot, Isaac Asimov (١٩٥٠)

**بەشی پێنجەم**

[٤٣] ئەخلاقناسی، تەحسین حەمەغەریب (٢٠١١)

[٤٤-١] Washington Imam marries gay Muslim couples despite backlash
source:http://english.alarabiya.net/en/perspective/features/٢٠١٢/٠٤/١٨/Same-sex-marriage-and-the-Muslim-community-in-the-U-S-.html

[٤٤-٢] ئەخلاقناسی، تەحسین حەمەغەریب (٢٠١١)، لا ١٣

[٤٥] Existentialism
Source: http://www.iep.utm.edu/existent/

[٤٦] SAME-SEX MARRIAGE LAWS, National Conference of State Legislatures

[٤٧] القرأن الكريم، سوره الاعراف (٨٢)

[٤٨] القرأن الكريم، سوره الاعراف (١٧٩)

[٤٩] Moral behavior in animals, Frans De Waal (٢٠١٢)
Source:http://www.ted.com/talks/frans_de_waal_do_animals_have_morals

# پێرست

## پێشەکی نووسەر



## پێشەکی کتێب



## بەشی یەکەم:

## "خوێندنەوەیەك بۆ فیلم و ڕۆمانی (Cloud Atlas)"

**بەشی دووەم:**

## " جیهان : لە وێرانبوون(Apocalypse) و دوای وێران بوون (Post-Apocalypse)"

## بەشی پێنجەم:

## " مۆراڵ (ئەخلاق) جێگرەوەی ئەقڵ بۆ پاراستنی مرۆڤایەتی و مرۆڤبوون"

## ئەو فیلمانەی ناویان هاتووە لەم کتێبە و وەك سەرچاوەی سەرەکی بابەتەکان بەکارهاتوون:

(Cloud Atlas) ،(WaterWorld)،)Roboco) ،(Alice in Wonderland), (The day After Tomorrow), (The Colony) ،)The Matrix((V for Vendetta) ، (٢٠١٢) ،(Snowpiercer) ،)Oblivion) ،(Triangle)(White House Down) ، (Vantage Point) ،(Skyline)(The book of Eli) ،(The Divide) ،(The Satan Bug) (Contagion) ،(Knowing) ،(War of the Worlds) (Independence Day) ،(E.T. the Extra-Terrestrial) ،(Oz The Great and Powerful ((District ٩) ،(Terminator) ،(Oblivion) ،(Omen)(End Of Days) ، (Daybreakers) ،(The happening) (World War Z) ،(Godzilla) ،(Jurassic Park)(Pacific Rim) ،(I am Legend) ،(Pacific Rim)(Seeking a Friend for The End of The world) (Inception) ،(Open Your Eyes) ،(Waking Life)(The Science of Sleep) ،(Paprika) ،(The Purge)(Wall-E) ،(i, Robot) ،(Man Of Steel)(Salvation: The Terminator) ،(Cast Away) (The Social Network).

# Hidden Intellect

Ausama Anwar

”

"هەموو داهێنانێك بە یەكەمین هەنگاو دەستی پێكردووە، ئەم ئیهتیمامەت بەم بوارە و بەم شێوە ڕەنگە ئەوڕۆكە كەم كورد فكری لێبكاتەوە. ئەمە بۆخۆی گرنگ و سەرنجڕاكێشە. من وەك خوسرەو جاف تەرازووەكەتم لا زەریف هاتە بەرچاو".

- خوسرەو جاف، ڕۆماننووس

"نووسەر لە جیاتی وەزارەتی ڕۆشنبیری و چەندین دام و دەزگای ئیداری و فەرهەنگی و تەعلیمی و یاسایی و ئایینی هەڵساوە بەو ئەركە گرنگە بەوەی ڕۆچۆتە زانست و فەلسەفە و ئایین و دادگەری. كەلێنێكی زۆر گەورەی پڕكردۆتەوە تا بەهۆیەوە بتوانین مەیدانی هونەریش بەجێ نەیەڵین بۆ قەدەری عەولەمە. بەڵكو ئەكتیڤی بكەین لە قازانجی ناسنامەی خۆمان".

- مەسعود عبدالخالق، نووسەر

"كتێبی (فیكری شاراوە)م خوێندەوە، تێڕوانینی نوێتری بۆ فیلم لەلام درووست كرد. فێرت دەكات كە ئیدی (ماریفەت) لەتەك (چێژ) لە سەیركردنی فیلمەكان وەربگریت و بسەنیت. ئەوەی من ئاگەداریم لەم بوارەدا تاقانەیە و هیچ كتێبێكی تری دەربارە نەنووسراوە. بۆیە لە ڕەفەی كتێبخانەی كوردییدا، سەنگدار و بەنرخ دەبێت".

- عەبدوڵڵا عالایی، توێژەر

“

لە بڵاوكراوەكانی ڕێنوێن

نرخ ٤٠٠٠ دینار




